# مەرگی مووچەخۆرێك

## گوڵبژێرێك لە چیرۆكەكانی عەزیز نەسین

هەڵبژاردن و وەرگێڕان و پێشەكی
جەلیل عەباسی





وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

# دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **مەرگی مووچەخۆرێك**

**گوڵبژێرێك لە چیرۆکەکانی عەزیز نەسین**

- **هەڵبژاردن و وەرگێڕان و پێشەکی: جەلیل عەباسی**
- **پیتچنین:** ئەدهەم عەباسی/ رەزا زەرنگار
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران رواندزی
- **بەرگ:** جێگر عەبدولجەبار
- **نرخ:** ١٥٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٢**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری لاوان (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٥٨)ی ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٣٢)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**

**رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**www .Kurdchap.com**

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# خوێنەری هێژا

نامەوێ لەم چەند دێرە کورتەدا"عەزیز نەسین"ت پێ بناسێنم، واتە پێت بڵێم چۆن و کەی و لەکوێ لە دایکبوو.. چیی کرد.. بە کوێ گەیشت و چۆن و کەی و لەکوێ ژیا و چۆن مرد و...، ئەم کارەش بە زیاد و دووبارە دەزانم چوونکە پێموایە (نەسین) دەمێکە جێی خۆی لە ناو گەلانی جیهاندا کردۆتەوەو ناو و هاوار و هەناسەی بۆ هیچ کەس نامۆ و نەناسراو نییە و دڵنیام بۆ خوێنەری کوردیش زیاتر ناسراوە. (نەسین) دەنگی رەسەنی بەرەی چەواشەکراو و بەشخوراوی سەردەمە، ئەو هاوارە ئاشنا و ناسراوەیە کە پێماندەڵێت:

***" کیمیا گەرەکانی سەدەی ناوەڕاست، نەیانتوانی بەرد بکەن بە زێڕ،***

***بەڵام من توانیم فرمێسکی خۆم بکەم بە قاقای پێکەنین و پێشکەشی جیهانی بکەم"***

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەناسەی ئەو (نەسین)، بۆتە تاڵاوی قاقای پێکەنینی گریاناویی مرۆڤی دەسخەڕۆ کراوی ئەم سەردەمە ویژدان تۆپیوە، ئاوا کەسێکیش، پێویستی بە ناساندن نییە، بەڵکوو بە خۆی و هەناسە مرۆییەکانییەوە چۆتە ناو دەمارەکانی ئاوات و خواست و هەست و هەناسەی مرۆڤایەتییەوە. بەڵکوو ئەمەوێ، بە کورتی ئەوەت بۆ باس بکەم کە چۆن بوو کەوتمە داوی هەناسەی ئەو رۆشنبیرە قۆشمەباز و بەتوانایەوە؟!

خەڵکی جیهانی سێیەم بە گشتی و ئێمەی کوردیش بەتایبەتی، بە درێژایی مێژووی مێژینەمان پێشێل کراوین، بەشمان خوراوە، ماڵ و مافمان لێ زەوت کراوە، چەواشە کراوین و هەڵخەڵەتێنراوین. ئەم راستییەش کاتێ تاڵتر و جەرگبڕتر دەبێ کە بزانین: بۆ هەر بەشخوراوی

و پێشێل بوونێك.. بۆ هەر چەواشە کردن و فریوخواردنێکیش چەند بەرانبەر منەتمان خراوەتە سەر و فیزو دەمارمان بەسەردا کراوە کە گوایا: خزمەتیان کردووین و فریشتەی رزگاریدەرمان بوون! ئێمەش زۆر ساویلکانە بەم فرتوفێڵە ئەهریمەنییە خەڵەتاوین و هاوارە کز و کپەکانی نارەزامەندیی ناخمان دامرکاون و دڵمان خۆش کردووە!! بە واتایەکی تر، خاوەن دەسەڵات و داگیرکاری چاوچنۆك، وەکوو ساوایەکی شیرەخۆرە سەیریان کردووین.. هەرکاتێ پرمەی گریانی برسێتی یا هەر چەشنە ئازار و نارەزامەندییەکی دی دەموچاوی گرژ کردبێن و لێوی خستبینە لەرزین، گورج مەمکەمژەیەکی لاستیکییان لە دەممان ئاخنیوە و پرمەی گریانەکەیان تاساندووین، ئێمەش وا تێگەیشتووین یاخود با بڵێم وا تێگەیەنراوین کە ئەو مەمکەمژە لاستیکییە، گۆی مەمکی ژیانبەخشە و شیری دایکانە دەڕژێنێتە ناو دەممانەوە و ئیتر بەو خەونە ساویلکانەیەوە کلۆکۆی دەروونمان دامرکاوە و خەریکی مژین و مژین و مژینەوەی بووینە! مژینێکی بێهوودەی منداڵانە و تا بڵێی گەمژانە، مژینێك کە لە جیاتیی شیری دایك، ژاری کوشندەی رژاندۆتە ناخمانەوە.. ژاری کوشندەی ساویلکەیی.. ڤایرۆسی مەرگاویی چەواشەیی و متبوون!! (عەزیز نەسین) بەو کارە نارەوا و نەشیاو و ناحەزەی زانیوە و ژیرانە پەی پێ بردووە، جوامێرانە و بوێرانە و رۆشنبیرانەش هەستاوە و بە هاوارێکی ئینسانی و هەناسەیەکی قۆشمەبازانە هاوار دەکات:

***کورە مەمژن.. ئەوە تەنها کوتە لاستیکێکی نەخۆش و دەرداوییە و بەس.. کورە مەخەڵەتێن..!***

***ئەو هەوەسبازانە جێی متمانە نین		هەر دەزانن سێو چنین و بەی رنین!!.***

کە لەگەڵ هەناسەی (نەسین)دا ئاشنا بووم، هەستم کرد هەناسەی خۆمە، هی گەلەکەمەو هی سەرجەم مرۆڤی چەوساوەیە، بۆیە لەگەڵیدا ژیام و لام پەسەند بوو، بۆیەش ویستم هەروا کە ئازارەکانی ((نەسین)) لەگەڵ ئازاری گەلەکەمدا هاو بەشن، زمان و کتێبخانەی گەلەکەشم لێی بەشداربێت. هەرچەند پێش منیش ئەم کارە کراوە، بەڵام هێشتا هەر کەمەو پێموایە((نەسین)) زۆر هاواری هاوبەشی هەیە کە زمانەکەی ئێمە لێیان بێبەشە و هەستم کرد پێویستە جێگایەکی بەرینتری لە گەنجینەی ئەدەبیماندا بدرێتێ، بەو هیوایەی رۆژێك بگات ئێمەش نووسەری رۆشنبیری وامان تێدا پەروەردە ببێت ،کە دوور لە هەرچەشنە ترس و شەرم و تەقیە و تەقوایەکی خێڵەکی و سیاسی و ناوچەیی، نەهامەتی و ناتەواوی و ناتەبایییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی و مێژووییەکانمان بخاتە ناو چوارچێوەی تابلۆی رەخنە و

دەرخستن و رسواکردن، تا ببێتە زەنگێکی ڕاچڵەکێنەر بۆ ئەقڵە نووستووەکانمان کە چیتر مەمکەمژەی لاستیکی بە گۆی مەمکی دایك نەزانین و بە (بەڵێ گەورەم.. بە چاوان گەورەم)، پشتی سەرەڕۆیی دزەکانمان ئەستوورتر نەکەین و بۆ گەندەڵکاری و کاولکاریی (گەورە) ناگەورەکانمان هۆتافی (هوڕا) نەکێشین. ئەم ئاواتەش، خەونێکە، تەنها بە هەبوون و زۆرتر بوونی (عەزیز نەسین)ەکان لە ناو ئێمەی کورددا دێتەدی..

عەزیز نەسین نووسەرێکی سادەیە بەزمانێکی ساکارەوە.. ئەو، پەروەردەی ئەدەبی سەرزارەکییە و ساکاری لە زمانی نووسینەکانیدا ئاشکرایە.. تەعبیرەکانی بە زمانێکی زۆر سادە و ڕەمەکیانە دەردەبڕێت و تەنها مەبەستی گەیاندنی پەیامێکی ڕاستەقینە و بێ (رتووش)ە بە زمانێکی خۆماڵی و جەماوەری، منیش هەوڵمداوە ئەو سادەیی و ساکارییەی زمانەکەی بپارێزم و تەنها لە بیری گەیاندنی پەیامەکەیدا بم، وەك چۆن خۆی وای ویستووە، هیوادارم لەم هەوڵە بچووکەمدا سەرکەوتوو بووبم.

هەرچۆن بێت، ئەم هەناسە ساردانەی عەزیز نەسین، دیارییەکی بچووك و خاکەسارانەیە لە لایەن منەوە بۆ ئەو دڵ و دەروونە زویرانەی کە هاوارو هەناسەی مرۆییان تێدا تاسێنراوە.

**ئێستاش با گوێ بۆ سەربردەی ئاماژەئاسای عەزیز نەسین بگرین و هەر لە زمانی خۆیەوە نزیکتر و باشتر بیناسین:...**

## عەزیز نەسین لەزمانی خۆیەوە:

باوکم، لە تەمەنی (١٣) ساڵی، لە یەکێك لە گوندەکانی ئەنەدۆڵەوە هاتە ئەستەموولْ. دایکیشم، ئەوکاتەی هێشتا زۆر منداڵ بوو، لە گوندێکی ترەوە هاتە ئەوێ. ئەوان، ناچار بوون سەفەربکەن، تا لە ئەستەموولْدا یەکدی ببینن و ببنە هاوسەری یەکدی تا من بتوانم بێمە دنیا. مافی هیچ هەڵبژاردنێکم نەبوو، هەر بۆیەش لە سەردەمێکی زۆر خراپ، لە خراپترین رۆژەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی (ساڵی ١٩١٥) و هەرواش لە شوێنێکی زۆر خراپ بەناوی دوورگەی (هەیبەلی) لە دایك بووم. هەیبەلی هاوینەهەواری دەوڵەمەندەکانی تورکیایە لە نزیك ئەستەمبووڵ، بەو پێیەی دەوڵەمەندەکان ناتوانن بە بێ هەژارەکان بژین، ئێمەش لەو دوورگەیەدا دەژیاین. بەم قسانەم، نامەوێ پێتان بڵێم گوایە مرۆڤێکی چارەڕەش بوومە، بە پێچەوانەوە، خۆشبەختم کە سەر بە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و نەجیبزادە و بەناوبانگ نیم.

من ناوم (نەسرەت) بوو، نەسرەت وشەیەکی عارەبییە بە واتای (یارمەتیی خواوەند)، ئەم ناوەش زۆر لەگەڵ بنەماڵەکەی مندا دەگونجا، چوونکە ئەوان هیوایەکی تریان نەبوو جگە لە خوا.

سپارتاکانی کۆن، منداڵە لەڕولاوازەکانی خۆیان بەدەستی خۆیان دەکوشتنەوە و تەنها منداڵە قەڵەو و بەهێزەکانیان گەورە دەکردن. بەڵام بۆ ئێمەی تورك، ئەم کارە بەهۆی سروشت و کۆمەڵگەوە ئەنجام دەدرا.. ئەگەر بڵێم چوار برای ترم هەر بە منداڵی مردن ،چوونکە بەرگەی بارودۆخی خراپی دەوروبەریان نەگرت، ئێوەش تێدەگەن کە من چەندە (کەللە رەق) بوومە ،کە گیان بەدەر بەرم و زیندوو بمێنم!

دایکم لە تەمەنی (٢٦) ساڵیدا مرد و ئەم دنیا جوانەی بۆ بەهێزترەکان بە جێهێشت.

لە وڵاتانی سەرمایەداریدا، هەلومەرج بۆ بازرگانەکان لەبارە و لە وڵاتانی سۆشیالیستیشدا بۆ نووسەران. واتە، ئەوەی ئەقڵی ژیانی هەبێت، دەبێ لە کۆمەڵگەیەکی سۆشیالیستیدا ببێتە نووسەر و لە کۆمەڵگەیەکی سەرمایەداریشدا ببێتە بازرگان، بەڵام من،

گەرچی لە تورکیا، لە وڵاتێکی وردە سەرمایەداریدا دەژیام و هیچ کەس لە ناو خێزانەکەشمدا هیچ خوێندەوارییەکی نەبوو، بڕیارمدا ببمە نووسەر.

باوکم، وەکوو دیکەی باوکە دڵسۆزەکان کە شێوازی بیرکردنەوە فێری منداڵەکانیان دەکەن، ئامۆژگاریی کردم: "ئەم بیرە پووچەی نووسین لەبیر بکە و بەدوای کارێکی چاك و شەرافەتمەندانە بکەوە کە بتوانی پێی بژیت".. بەڵام من، بە گوێم نەکرد.

کەللە رەقیم هەر بەردەوام بوو.. ئاواتم ئەوە بوو ببمە نووسەر و قەڵەم بگرمە دەستمەوە، کەچی سەرم لە قوتابخانەیەك دەرهێنا، کە چەکیان دایە دەستم!.

لە ساڵە سەرەتاییەکانی ژیانمدا نەمتوانی ئەو کارانە بکەم کە حەزم لێیان بوو، ئەو کارانەم دەکرد کە هیچ حەزم لێیان نەبوو. دەمویست ببمە نووسەر، کەچی بوومە سەرباز.. ئەو سەردەمانە، تەنها قوتابخانەیەك کە منداڵە هەژارەکان دەیانتوانی تێیاندا بخوێنن، قوتابخانەی سەربازی بوو، هەربۆیەش ناچار بووم بڕۆمە یەکێك لەو شوێنانە.

## ساڵی (١٩٣٣):

وەکوو هەمیشە درەنگ گەیشتم، ئەمجارەش هەرهەموو ناوە جوانەکان تەواو ببوون و هیچ ناوێك نەبوو من بۆ شۆرەتی خۆم هەڵیبژێرم و بتوانم شانازیی پێوە بکەم.. ناچار بووم (نەسین) پەسەند بکەم.. نەسین واتە (تۆ چییت؟).. دەمویست هەرجارێك ناوم دێنن، بیر لەوە بکەنەوە کە: لەڕاستیدا من چیم؟!

ساڵی (١٩٣٧) بوومە ئەفسەر.. بوومە ناپلیۆن.. بڕوا ناکەن؟ من، تەنیا یەکێك بووم لە دەیان ناپلیۆن.. هەرهەموو ئەفسەرە نوێیەکان، وایاندەزانی ناپلیۆنن.. ئەم نەخۆشییەش هیچ چارەیەکی نەبوو و تا کۆتایی ژیانیان پێوەی دەتلانەوە، ئەڵبەت هەندێکیش پاش ماوەیەك چاك دەبوونەوە. (ناپلیۆنیتیس) نەخۆشییەکی پڕ مەترسی و گوازراوەیە و ئەمەش نیشانەکانیەتی: نەخۆشەکان، تەنها بیر لە سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن دەکەنەوە نەك شکستەکانی.. ئەوان لە بەرانبەر نەخشەی جیهاندا دەوەستن و بە قەڵەمێکی سوور لەماوەی پێنج خولەکدا هەر هەموو جیهان داگیردەکەن و دواییش خەمبار دەبن لەوەی: بۆچی ئەم دنیایە ئەوەندە بچووکە!. ئەمانە، وەکوو نەخۆشێکی (تا) دار هەمیشە خەریکن وڕێنە دەکەن.. جگە لەمانەش، نەخۆشی و مەترسیی دیکە لە ڕێدان: نەخۆشەکان، لەوانەیە لە

قۆناغەكانی دواتردا وا بیر بكەنەوە كە بوونەتە تەیمووری لەنگ، چەنگیز خان، ئاتیلا، هانیبال یا تەنانەت هیتلەر!.

من، وەكوو ئەفسەرێكی تازە نەفەسی بیست ودوو، بیستوسێ ساڵە، لەماوەیەكی كورتدا و بە قەڵەمێكی سوورەوە هەموو دنیام داگیر كرد.. گرێی ناپلیۆن بوونم یەك دوو ساڵێكی خایاند، ئەڵبەت لەم ماوەیەدا هیچ حەزێكیشم بەلای (فاشیست)دا نەبوو.

هەر لە منداڵیمەوە حەزم دەكرد ببمە شانۆنامەنووس.. لە ناو سوپادا یەكەی سەربازی و تۆپخانە و تانك هەبوو ،بەڵام شتێكمان بەناوی یەكەی شانۆ نەبوو، بۆیە منیش لەبیری رێگایەكدا بووم بۆ دەربازبوون و سەرەنجام ساڵی (١٩٤٤) ئازاد بووم. هەندێ ئەفسەر هەن، تەنانەت پاش ئەوەش دەبنە ژەنەراڵ، هێشتا حەسرەتی نووسینی شیعر یا رۆمانیان لە دڵدایە، ئەڵبەت ئەمەش زۆرتر بۆ دەسخۆشانەی خەڵكی ترە نەك بۆ حەز و خولیای خۆیان، بەڵام، ئەگەر شاعیرێكی پەنجا ساڵە بیەوێ ببێتە فەرماندەی سوپا، ئەوا بەلایانەوە زۆر گەمژانە و نەزانانەیە.

لە سەردەمی سەربازیدا نووسینی رۆمانم دەسپێكرد.. لەو سەردەمەدا، سەربازێك كە شتی بۆ رۆژنامەكان بنووسیبایە، دەكەوتە بەر گاڵتە و دڵڕەقیی ئەوانی تر، بۆیە منیش بەناوی خۆمەوە نەمدەنووسی، بەڵكوو بەناوی باوكم (عەزیز نەسین)ەوە دەمنووسی، هەرئەمەش وای كرد كە ناوی سەرەكیم (نەسرەت نەسین) بە نەناسراوی بزر ببێت و فەرامۆش بكرێت!.

من وەكوو نووسەرێكی گەنج دەناسرام، لە حاڵێكدا باوكم پیر و بەتەمەن بوو، تەنانەت جارێكیان كاتێ بەمەبەستی دەستەبەركردنی كارو پیشەیەك سەردانی فەرمانگەیەك دەكات و خۆی دەناسێنێ (عەزیز نەسین)، هیچ كەس بڕوای پێ ناكات.. باوكم تا كاتی مەرگیش هەر هەوڵی ئەوەی دەدا بیسەلمێنێت كە ئەو، خودی (عەزیز نەسین)ە!. منیش، ساڵەكانی دواتر كە كتێبەكانم وەرگێڕدرانە سەر زمانەكانی تر، كاتێ دەمویست ئەو پاداشتی نووسینانە وەربگرم كە بەناوی عەزیز نەسینەوە بوون، تووشی كێشە بووم و زۆری پێچوو تا بیسەلمێنم ئەو (عەزیز نەسین)ە منم ،گەرچی ناوی راستەقینەی ناو ناسنامەكەم (نەسرەت نەسین)ە.

ئەم رۆژانە، زۆرێك لەوانەی بانگەشەی شاعیرێتی دەكەن، وا دەزانن هەر چییەك دەیڵێن، هەمووی شیعرە.. هۆكارەكەشی ئەوەیە كە هیچ رێز و نرخ و بایەخێك بۆ شیعر قایل نین.. من وا دەزانم شاعیرێتی هونەرێكی گەورەیە، چوونكە هەندێ نووسەر كە نەیانتوانی ببنە شاعیری باش، دواتر بوونە نووسەری ناودار و سەركەوتوو، ئەمە دەربارەی خۆم نییە، چوونكە بە روونی

سەلماندوومە کە چۆن شیعری خراپ دەهۆنرێتەوە.. ئەو سەرنجە زۆرەی دراوەتە شیعرەکانی من، بەڵگەی جوانی و باشییان نییە، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ ناوی ئەو (ژن)ەی لە کۆتایی شیعرەکانمدا دێت، من شیعرەکانی خۆم بەناوی خوازراوی ژنێکەوە بڵاو دەکردنەوە، ناوێك، کە گەلێ نامەی عاشقانەی بۆ نووسرا و بۆی هات!.

هەر بە منداڵی، حەزم دەکرد بابەتگەلێك بنووسم، خەڵك بخاتە گریان، هەر بۆ ئەم مەبەستەش چیرۆکێکم نووسی و بۆ گۆڤارێکم نارد، سەرنووسەری گۆڤارەکە تێبینەگەیشتبوو و دوای خوێندنەوەی تێرتێر پێکەنی، ئەڵبەت دوای ئەوەی هەموان تێرتێر پێکەنین، بەناچار فرمێسکەکانی خۆی سڕین و گوتی: "زۆر باشە، بەردەوام بە و هەر لەم چیرۆکانەمان بۆ بنووسە". ئەم رەوتە لە نووسینەکانمدا درێژەی هەبوو.. خوێنەرەکانم، بە زۆربەی ئەو شتانەی کە بۆ گریاندنیان نووسیبووم، پێدەکەنین.. ئیتر وەکوو (تەنز) نووسێك ناسرام لە حاڵێکدا هێشتاش نەمدەزانی تەنز چییە؟!. تەنانەت ناتوانم بڵێم کە هێشتاش دەزانم.. من نووسینی تەنز هەر لەگەڵ ئەنجامدانیدا فێر بووم.. زۆرجار بەجۆرێك لێمدەپرسن تەنز چییە، وەك بڵێی نووسراوێك یا فۆرموولێك بێت، بەڵام ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە کە تەنز بابەتێکی زۆر جیدییە.

ساڵی (١٩٤٥)، حکوومەت هانی هەزاران کۆنە خوازی دا، تاوەکوو رۆژنامەی (تان) لەناو بەرن.. منیش لەوێ کارم دەکرد و پاش ئەو کارەساتە ئیدی بێکار کەوتم.. ئەوان، هیچ نووسراوێکیان بەناوی منەوە پەسەند نەدەکرد، منیش ناچار بووم بابەتەکانم بە زۆرتر لە دووسەد ناوی خوازراوی جۆراوجۆرەوە بۆ رۆژنامەکان بنێرم، هەر لە سەروتار و نوکتەوە بیگرە تا دەگاتە دیمانە و چیرۆك و رۆمانی پۆلیسی.. هەرکە خاوەنی رۆژنامەیەك دەیزانی ئەو ناوە خوازراوە منم، ئەوا زوو ناوێکی دیکەم بۆ نووسینەکانی دواتری خۆم دادەهێنا. ئەم ناوە داتاشراوانە شتی سەیریان بە دوادا هات، بۆ نموونە بە تێکەڵکردنی ناوی کوڕو کچەکەم، ناوی (خەیاڵ ئاگر)م داهێنا و کتێبێکم بۆ منداڵان بەو ناوەوە نووسی.. حکوومەت نووسەر و ناوەکەیشی نەدەناسی و هەر بۆیەش لە سەرجەم قوتابخانە سەرەتاییەکانیدا بەکاری دەبرد و ناوی (خەیاڵ ئاگر)یش وەك نووسەرێکی ژن، لە کتێبنامەی ژنە نووسەرەکاندا تۆمار کرا. چیرۆکێکم بەناوێکی خوازراوی فەرەنسی لە گۆڤارێکدا بڵاو کردەوە کە دواتر وەکوو تەنزێکی فەرەنسی لە هەڵبژاردەی تەنزی جیهاندا تۆمار کرا.. چیرۆکێکیشم بەناوێکی تری خوازراوی چینی لە گۆڤارێکی تردا بڵاو کردەوە کە ئەویش دواتر وەکوو وەرگێڕانێك لە زمانی چینییەوە ناسرا.

ئەو کاتانەی نەمدەتوانی بنووسم، گەلێ ئیشوکاری جۆراوجۆرم دەکرد، وەکوو: دووکانداری، فرۆشیاری، ژمێریاری، رۆژنامە فرۆشی، وێنەگری و...، بەڵام هیچکامیشم بە چاکی ئەنجام نەدەدان.

بە گشتی، پێنج ساڵ و نیو لەسەر نووسینەکانم زیندانی کرام، شەش مانگی بە هۆی سکاڵا و داخوازیی (فاروق)ی پاشای میسر و (رەزاشا)ی پاشای ئێران بوو، ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە گوایە من لە نووسینەکانمدا سووکایەتیم پێ کردوون و ئیدی لە رێگەی باڵیۆزەکانیانەوە لە ئەنکەرە، کێشامیانە دادگا و شەش مانگ زیندانیان بەسەرمدا سەپاند.

ئێستا چوار منداڵم هەن: دوانیان لە ژنی یەکەمم و دوانیش لە ژنی دووەم.

ساڵی (١٩٤٦) بۆ یەکەمجار گیرام، شەش رۆژی تەواو پۆلیس لێی پرسیم: "نووسەری راستەقینەی ئەو بابەتانەی بەناوی تۆوە بڵاو دەکرێنەوە کێیە؟"، ئەوان بڕوایان نەدەکرد کە هەر خۆم ئەو بابەتانەم نووسیون! بەڵام دوو ساڵ دواتر شتەکە پێچەوانە کەوتەوە، ئەمجارەیان پۆلیس بانگەشەی ئەوەی دەکرد گوایە من بابەتم بەناوی دیکەوە نووسیوە.. جاری یەکەم هەوڵم دەدا بیسەلمێنم نووسینەکان هی خۆمن و جاری دووەمیش دەمویست بڵێم هیچ پەیوەندییەکیان بە منەوە نییە، کەچی شایەتێکی زۆرزان هات و شایەتیی دا کە من بابەتێکم بە ناوێکی ترەوە نووسیوە و ئەمەش وای کرد شەش مانگ، ئەویش لەسەر بابەتێك کە لە راستیدا نەمنووسیبوو زیندانی بکرێم!. رۆژی زەماوەندم لەگەڵ ژنی یەکەممدا، گرووپی ئۆرکێسترا ئاهەنگی دەژەنی و من لە ژێر سێبەری شمشێری ئەفسەرە دۆست و هاوکارەکانمدا دەرۆیشتم، کەچی حەڵقەی هاوسەرێتیی دووەمم لە پشت میلە ئاسنینەکانی زینداندا کردە پەنجەی ژنەکەم، دەبینن دەسپێکێکی خۆش نەبووە!.

ساڵی (١٩٥٦) لە پێشبڕکێی جیهانیی تەنزدا بوومە یەکەم و خورمای زێڕینم وەرگرت.. ئەو گۆڤار و رۆژنامانەی کە پێشتر بابەتەکانمیان بڵاو نەدەکردنەوە، ئێستا ئیدی سەرودەستیان بۆ دەشکاندن، بەڵام ئەم بارودۆخە زۆری نەخایاند. سەرلەنوێ چاپ و بڵاوکردنەوەی نووسراوەکانم قەدەغە کرا و ساڵی (١٩٥٧) ناچار بووم خەڵاتێکی تری خورمای زێڕین وەربگرم تا دووبارە ناوم بکەوێتەوە سەر رووپەڕی رۆژنامە و گۆڤارەکان.. ساڵی (١٩٦٦)یش پێشبڕکێی جیهانیی تەنز لە بولگارستان بەڕێوەچوو و منیش وەکوو براوەی یەکەم، ژووژکی زێڕینم پێ بەخشرا.

دوای شۆڕشی (٢٧)ی نایسی ساڵی (١٩٦٠)ی تورکیا، بە ویستی خۆم یەکێك لە خورما زێڕینەکانم بەخشییە خەزێنەی دەوڵەت، کەچی چەند مانگێکی پێنەچوو گیرام و زیندانی

کرام.. ئیتر ژووژك و ئەو خورما زێڕینەکەی ترم لای خۆم بۆ ڕۆژەکانی داهاتوو هەڵگرتن و بە خۆم گوت: بێگومان ڕۆژێك هەر بە کەڵکم دێن.

خەڵك سەریان دەسووڕمێت لەوەی من تا ئێستا زیاتر لە دووهەزار چیرۆکم نووسیون، لە حاڵێکدا ئەمە هیچ جێی سەرسووڕمان نییە، ئەگەر بنەماڵەکەم بە جیاتی دە کەس، بیست کەس بوونایە، ئەوا ناچار دەبووم زیاتر لە چوارهەزار چیرۆك بنووسم.

ئێستا تەمەنم پەنجاوسێ ساڵە.. پەنجاوسێ کتێبم نووسیون.. چوار هەزار لیرە قەرزارم.. چوار منداڵ و نەوەیەکم هەیە.. بە تەنیا دەژیم.. بابەتەکانم بە بیست و سێ زمان و کتێبەکانیشم بە (١٧) زمان وەرگێڕدراون و بڵاوبوونەتەوە.. شانۆنامەکانم لە حەوت وڵاتدا براونەتە سەر سەکۆ.. تەنیا دوو شت هەیە کە دەتوانم لە خەڵکی بشارمەوە: ماندوویێتیم و تەمەنم، جگە لەم دوانە، هەموو شتێکی ژیانم شەفاف و ئاشکرا بووە.. دەڵێن، لە تەمەنی خۆم گەنجتر دەنوێنم، ڕەنگە هۆکارەکەی ئەوە بێت، ئەوەندە سەرقاڵم و ئیشوکارم زۆرە، نەمپەرژاوەتە سەر پیری.

هیچ کاتێك بە خۆم نەگوتووە: "ئەگەر جارێکی تر زیندووبوومایەوە، ئەوا هەمان ئەم کارانەم دەکرد" گەر وابێ، ئەوا حەز دەکەم زیاتر لە جاری پێشوو کار بکەم.. زۆر زۆر زیاتر و زۆر زۆر باشتر.

ئەگەر لە مێژووی مرۆڤدا تاقە یەك کەسی نەمر هەبێت، بە شوێنیدا دەگەڕێم تا ڕێنموونیم بکات چۆن دەتوانم نەمر و هەمیشە زیندوو بم. بە داخەوە لە ئێستادا هیچ مۆدێل و سەرمەشقێکم نییە، تاوانی من نییە، ناچارم وەکوو ئەوانی تر بمرم، هەر لەبەر ئەمەشە تووڕەم، چوونکە ئاشقی مرۆڤ و مرۆڤایەتیم.

ئەمە تاقانە چیرۆکی ناتەواوی منە تا ئێستاش.. دەزانم خوێنەران لە نووسراوی دوورودرێژ ماندوودەبن، وابزانم ئەنجامی چیرۆکەکەی من زۆر درێژە ناکێشێت.. ئەوەی حەز دەکەم بیزانن، ئەوەیە کە هیچ کات لە کۆتایی ئەم چیرۆکە تێناگەم.

ئەم نووسەرە چالاك و بوێرەی بواری تەنز و تەوس، وەکوو خۆی دەڵێ، زیاتر لە دووهەزار چیرۆکی بڵاو کردوونەتەوە، بە ڕادەیەك، زۆرجار ناوی چیرۆکەکانی لەبیر نەماوە، خۆی دەگێڕێتەوە: "جارێکیان لە کۆڕێکدا دانیشتبووین، کابرایەك چیرۆکێکی خوێندەوە، زۆرزۆرم بەلاوە جوان بوو، هەستام و ماچێکی کابرام کرد و دەسخۆشیم لێکرد بۆ ئەو بەرهەمە

جوانەی، کابرا بە پێکەنینێکەوە گوتی: مامۆستا، خۆ ئەمە چیرۆکی خۆت بوو من خوێندمەوە!". بەهەرحاڵ لە ماوەی چل ساڵی تەمەنی نووسینیدا، واتە لە ساڵی (١٩٤٥)ەوە تا ساڵی (١٩٩٥) بە سەدان یادگاری جوانی بەخشییە دنیای نووسین و هەزاران تانە و تەوس و توانج و پلاری گرتە گەندەڵییە بێسنوورەکانی وڵاتەکەی لە هەرهەموو بوارەکانەوە.

ئەمەش ناوی ئەو بەرهەمانەی لەپاش ئەم نووسەرە ئازا و چالاکە بەجێماون...:

## بەرهەمەکانی عەزیز نەسین:

### کـــــــــــورتە چیرۆك:

١- شتە بەجێماوەکان/١٩٤٨

٢- کلکی سەگ/١٩٥٥

٣- پارچەی یەدەگ/١٩٥٥ (تکایە، وشەی پارچە بە قوماش وەر نەگیرێت/ج.ع).

٤- حەمدی فیل/١٩٥٥

٥- شێتێك لەسەر بان/١٩٥٦

٧- کورسیی دەستدار/١٩٥٧

٨- رێورەسمی قازان/١٩٥٧

٩- دەعبای تورۆس/١٩٥٧

١٠- شێتەکان یەکتریان تەڵاق دا/١٩٥٧

١١- بەشی گەرەك/١٩٥٧

١٢- کەری مردوو/١٩٥٧

١٣- کامە حزب دەیباتەوە/١٩٥٧

١٤- قسە لێرە و لەوێ/١٩٥٨

١٥- کاك فیکە/١٩٥٨

١٦- دەزگای هەستیار/١٩٥٨

١٧- ختووکە/١٩٥٩

١٨- ئافەرین/١٩٥٩

١٩- شەڕی کوێر/١٩٥٩

٢٠- مەحمود و نیگار/١٩٦٠

٢١- عەینەکی چاوەکانت/١٩٦٠
٢٢- ئاخ، ئێمەی کەر/١٩٦٠
٢٣- شێتێك بۆ سەد لیرە/١٩٦١
٢٤- ئێمە نابینە بەشەر/١٩٦٢
٢٥- چۆن دەکرێ حکوومەت بڕوخێنرێت/١٩٦١
٢٦- بڕۆنە ئەولا، سۆشیالیسم بەڕێوەیە/١٩٦٥
٢٧- چۆن شۆڕشمان کرد/١٩٦٥
٢٨- ڕەفعەت بەگ چۆن خۆی خستە دەردیسەری/١٩٦٥
٢٩- گازی سەوزڕەنگی نامووس/١٩٦٥
٣٠- ماڵی وەك هێلانەی بولبول/١٩٦٨
٣١- سەری نیشتمان خۆش بێت/١٩٦٨
٣٢- بژی نیشتمان/١٩٦٩
٣٣- مانگرتنی گەورە/١٩٧٨
٣٤- جناو بە ئاژەڵ مەدە/١٩٨٠
٣٥- سلاو، حەفتا ساڵەییم/١٩٨٤
٣٦- تەنانەت (تەزویر)یش ناکرێت/١٩٨٤
٣٧- خانوویەك بۆ کچی ماچین/١٩٨٧

**رۆمـــــــــان:**

١- ئەو پیاوەی بوو بە ژن/١٩٥٥
٢- کاکی گوڵ، سەعید، باز بدەرە سەرەوە، سەعید/١٩٥٧
٣- جوانیی پیاوانە/١٩٥٧
٤- تاسی/١٩٥٩
٥- زوبوك/١٩٦١
٦- منداڵانی ئەم سەردەمە بەڵان/١٩٦٧
٧- نازناو/١٩٧٦
٨- تاقە ڕێگا/١٩٧٨

**بیـــــــــرەوەری:**

١- بیرەوەرییەکانی دوورخراوەیەك/١٩٥٧

٢- وابوو، وا نابێ/١٩٦٦ تا ١٩٧٧

٣- لە دایرەی پۆلیسدا/١٩٦٧

٤- سەرەتا سەرکەوتن/١٩٨٢

٥- شێتەکانی من/١٩٨٤

٦- عەزیز نەسین، مەلا نەسرەدینی سەردەم/١٩٨٤

٧- مشتێك مرۆڤی ئیعدامی/١٩٨٧

٨- منیش منداڵ بووم/١٩٨٩

٩- خەونەکانم لێ تێك مەدە/١٩٩٠

**ئـــــــــەفسانە:**

١- رۆژێك لەسەر زەمێنێکدا/١٩٥٣

٢- هەڵقون هەڵقون/١٩٦٠

٣- گوێرەکە گیان بنوو/١٩٧١

٤- ئەفسانەکانی بابا عەزیز/١٩٧٨

**حـــــــــەکایەت:**

١- مەکینەی گوتاردان/١٩٥٨

٢- چووینە نزیك، چووینە دوور/١٩٥٩

٣- سلاو/١٩٧١

٤- نووسراوە مەحکووم و بەخشراوەکان/١٩٨٢

٥- وای لە ئێمەی رۆشنبیرە ترسنۆکەکان/١٩٨٥

٦- لە ژێر لێپرسینەوەدا/١٩٨٦

٧- ترس لە ترس/١٩٨٨

٨- کوردەکانی بولگارستان، کوردەکانی تورکیا/١٩٨٩

٩- پێش ناکەوین/١٩٨٩

**شیعـــــــــــر:**

١- لە سەرەتای كۆتاییەوە/١٩٨٤

٢- دەی ماوە بۆ ئەشق، پێنجی ماوە بۆ مەرگ/١٩٨٦

٣- خۆ خستنە گێر/١٩٨٨

٤- بەخێر بێن/ ١٩٩٠

٥- دەردی سیواس/١٩٩٥

**گاڵتەجـــــــــــاڕی:**

١- عەزیز نامە/١٩٧٩

**سەفەرنـــــــــــامە:**

١- مەڵێن بیستمان و نەمانبیست/١٩٧٦

٢- دنیا قازانە و منیش كەوچك/١٩٧٧

**شانۆنـــــــــــامە:**

١- تكایە، دەكرێ بێن؟/١٩٥٨

٢- مەت، كارێك بكە/١٩٥٩

٣- دەعبای تورۆس/١٩٦٣

٤- شەڕی نای ژەنەكان و شانەی ژنان/١٩٦٨

٥- چیچو/١٩٧٩

٦- رونی، دەستم بگرە/١٩٧٠

٧- ئازیزم، وەرە بكوژە/١٩٧٠

٨- پێنج شانۆی كورت/١٩٧٩

٩- سەرجەم شانۆنامەكان/١٩٨٢

١٠- نەوەی باربارۆس/...

١١- هەقی، هەقەكەم بدە/...

١٢- یاشار نە مردووە و نە زیندووە/...

**هـــــــــەڵبژاردە:**

١- تەوسی تورکی لەسەردەمی کۆماردا/١٩٧٣

**گـــــــــوتارەکان:**

١- مرۆڤەکان، لەڕێگەی قسەکردنەوە ئاشنا دەبن/١٩٨٨

**بابـــــــــەتەکان:**

١- رەنجی سیواس/١٩٩٥

٢- پشیلەکان لەناو توورەکەدا/١٩٩٥

٣- ئەی لە وڵاتی ئێوەدا کەر نییە؟/١٩٩٥

٤- ئەو کتێبانەی کە دیانخوێنمەوە/...

**نامـــــــــەکان:**

١- نامەگۆڕینەوە، عەزیز نەسین، عەلی نەسین/١٩٩٤

٢- کوڕی خۆشەویستم، باوکی خۆشەویستم، نامەگۆڕینەوەی نێوان عەزیز نەسین و عەلی نەسین/١٩٦٦ تا ١٩٨١

**خـــــــــەڵاتەکان:**

١- ١٩٥٦/ خورمای زێڕ، لە ئیتاڵیا بۆ چیرۆکی حەمدی فیل

٢- ١٩٥٧/ خورمای زێڕ، هەر لە ئیتاڵیا بۆ چیرۆکی رێوڕەسمی قازان

٣- ١٩٦٦/ ژووژکی زێڕ، لە بولگارستان

جەلیل عەباسی.. مەریوان.. ١٩٩٧/٩/١٨

* * *

# ئەگەر تۆ نەبووایەیت

**(شانۆ / لە سێ پەردەدا)**

**پەردەی یەکەم:**

( ژووری بەڕێوەبەری بەخش... مدیر ناحیە لە پشتی مێزەکەیەوە دانیشتووە و پیاوێکی شڕۆڵەی لادێیی لە بەرامبەریدا بە ڕێزەوە ڕاوەستاوە)

گوندی: - جەنابی بەڕێوەبەر، ئاوەکەیان بڕیوین، خۆ من ساڵی ڕابردوو پێنجسەد لیرە پارەی ئاوم دایە خزمەتی بەڕێزتان .

مدیر ناحیە: - ئەوە هی پار بوو، بۆ ئەمساڵ چەندت داوە؟

- گەورەم ئەمساڵ خەرج زۆر گرانە...

- ئەگەر ئاوت دەوێ دەبێ هەزار لیرە بدەی.

- بەڵام گەورەم...

- بەڵام و مەڵامی ناوێ، هەر ئەوەیە کە گوتم.

( کابرا دەچێتە دەرەوەو دوای ماوەیەکی کورت گوندییەکی دیکە دێتە ژوورەوە)

بەڕێوەبەری ناحیە:

- دەی، بووبە چی؟... پارەت هێنا؟

گوندی:

- بەڵێ، گەورەم، هەزار لیرەمان قەرز کردووە پێشکەشی دەکەین.

بەڕێوە بەری بەخش:

- چی؟... هەزار لیرە؟... هەی...! پێش تۆ حەمە لێرە بوو، هەزارودوسەد لیرەشی ئەدا... با لەسەری نەڕۆین، هەزار و پێنسەد لیرە کەمتر نابێت.

گوندی: - بەڵام گەورەم...
بەڕێوەبەری بەخش:
- بەڵام مەڵامی نیە.
*(( پەردە دائەدرێتەوە ))*

**پەردەی دووەم:**
((ژووری پارێزگار، هەردوو گوندییەکە لە بەردەم پارێزگاردا ڕاوەستان))
گوندیی یەکەم:
- جەنابی پارێزگار، جەنابی بەڕێوەبەری ناحیە ئاوەکەی لێ بڕیوین، ئاوێك کە خودا داویەتی. ڕشوەی لێمان دەوێت. ئەمانخاتە گیانی یەکتری، ساڵان پێنجسەد لیرەی لێ دەسەندین کەچی ئەمساڵ داوای هەزار و پێنسەد لیرەمان لێ دەکات، جەنابی پارێزگار، ئێمە یەکەم خوا و دووهەم ئێوەمان هەیە، دەستمان داوێنت بگەرە فریامان.
((پارێزگار بیری لێدەکاتەوە... بڕیار دەدات بەڕێوەبەری بەخش لە کاتی تاوانەکەیدا بگرێت ،بۆیە لە ناو مێزەکەیدا هەزار و پێنجسەد لیرە دەردەهێنێت و ژمارەکەیان لای خۆی تۆمار دەکات و دەیانداتە گوندییەکان کە بیبەن بۆ بەڕێوەبەری ناحیە.))
*پەردە دائەدرێتەوە*

**پەردەی سێهەم:**
((ژووری بەڕێوەبەری بەخش، کابرای گوندی لەبەرچاوی بەڕێوەبەری ناحیەدا پارەکە ئەژمێرێت و دەیداتە دەستی بەخشدار و دەچێتە دەرەوە. بە پشتەسەری بەڕێوەبەری ناحیەوە وێنەی پیاوێکی مەزن خراوەتە ناو قاپ و هەڵواسراوە. پاش چوونە دەرەوەی گوندییەکە، دەنگ و هەرایەکی نائاسایی هەڵدەستێ، بەڕێوەبەری ناحیە لە مەسەلەکە تێدەگات و ئەزانێ کە هاتوون بە تاوانی ڕشوەخۆری بیگرن. بۆیە پارەکە لە پشتی قاپی وێنەی پیاوە مەزنەکەوە ئەشارێتەوەو لێی دائەنیشێت. پارێزگار و گوندییەکان و چەند پۆلیسێك بە پەلە دێنە ژوورەوە.))
پارێزگار:
- ئەو پارەیە دەربێنە

بەڕێوەبەری ناحیە:

- کامە پارە گەورەم؟

پارێزگار:

- ئەو پارەیەی لەم گوندنشینە هەژارەت سەندووە.

((پارێزگار و بەڕێوەبەری ناحیە خەریکی مقۆ مقۆ دەبن. گیرفان و ناو جانتاکەی بەڕێوەبەری ناحیە دەگەڕێن کەچی هیچ پارەیەك نادۆزنەوە. بەڕێوەبەری ناحیە کە لە پلانەکەیدا سەرکەوتووە گورج سکالایەك دژی دوو گوندییەکە تۆمار دەکات و هەردوکیان بە تاوانی درۆ هەڵبەستن و بوختان کردن دژی بەڕێوەبەرێکی دەست و چاو پاك و دڵسۆزی وڵات قۆڵبەست دەکەن و، یاڵڵا بۆ زیندان. پاش ئەوەی گوندییەکان ڕەوانەی بەندیخانە دەکرێن و پارێزگار و پۆلیسەکانیش دەچنە دەرەوە و ژوورەکە چۆڵ دەبێت، بەڕێوەبەری ناحیە ڕوو دەکاتە وێنەی پیاوە مەزنەکە و لە بەرامبەریدا بە ڕێزەوە چۆك دائەدات))

بەڕێوەبەری ناحییە بە کڕنۆش بردن و کرووزانەوە:

- ئەی گەورەی مەزن، ئەی ڕزگاریدەری بێ هاوتا، ئەگەر تۆ نەبوایایت، تەنیا خوا دەزانێ من چیم بەسەر دەهات.

تەنیا تۆی کە منت لە چنگی ڕسوایی و مەرگ ڕزگار کرد، ئای هەر بژیت. تۆ پارێزگاری ڕاستەقینەی شەرەف و ناموسی ئێمەی. ئەی ڕزگاریدەری مەزن و بێ وێنە هەر بژی... بژی.

***پەردە دائەدرێتەوە.***

## سەفەر بۆ ناو هەسارەی مانگ

ئەرێ باشە... ئەم کارە بەس تایبەتی وڵات و گەلی ئەمریکایە؟... ئەی لە وڵاتانی دواکەوتووی وەك وڵاتی ئێمە ناکرێ، یان نابێ بکرێ؟ وەکو لە ڕۆژنامەکاندا ئەخوێنینەوە، لە ئەمریکادا چەندین کۆڕ و دەستە و ئەنجومەنی وەك (کۆمەڵەی شەش پەنجەکان)، (ئەنجومەنی ئەوانەی وا پێڵاوی ژمارە ٤٧ لەپێ دەکەن) (ئەنجومەنی ئەو پیاوانەی کە ژنەکانیان لێیان دەدەن) و...تاد هەن و خەریکی هەوڵ و چالاکیی ڕۆژانەی خۆیانن. باشە ئێمە چیمان لەوان کەمترە کە نابێ ئەنجومەن و کۆمەڵ و ڕێکخراوەمان هەبێت؟... بیرم کەوتەوە... ئێمەش ڕێکخراوی ((سەفەر بۆ ناو مانگ))مان هەیە و بەرنامەکانیشی لەگەڵ بارودۆخی ڕۆحیی مندا ئەگونجێن. منیش کە تا ئەو ڕۆژە شوێنێکی ترم بێجگە لە ناوچەکەی خۆمان نەدیبوو، بێجگەش لە ئۆتۆمبێلی ناو شارەکانی خۆمان سواری هیچ شتێکی تر نەبووبووم، داوای ئەندامێتیی ئەو ئەنجومەنەم کرد، بەڵکو بتوانم شارگەلێکی وەك پاریس و نیۆیۆرك لە بەرزایی ئاسمانەوە ببینم و سەیریان بکەم. ئەو نیوەڕۆیە بەوپەڕی کەیف و خۆشی خۆم گەیاندە ماڵەوە و بە بۆنەی ئەندامێتی ئاوا ڕێکخراوەیەك، خۆم لای ژن و منداڵەکەم هەڵکێشا و ماوەیەك وەك میر و سەرۆکان بە چواردەوری تەنیا ژوورەکەماندا پیاسەم کرد. ژنەکەم کە لەو گۆڕانکارییە ناکاوەی هەڵسوکەوتی من هیچ تێنەگەیشتبوو، بە بێدەنگی چێشتی لێنا و سفرەی ڕاخست و منیش نانێکی زۆرم خوارد و پاشان لە پاڵ سۆپاکەدا لێی ڕاکشام. هێندەی نەبرد.. هەستم کرد لە جێی گۆشت و خوێن و ئیسقان، دوکەڵێکی چڕ لە جەستەمدایە و هێواش هێواش دووکەڵەکە بەرەو ئاسمانم دەبات. هەر ئەڕۆیشتم و تا دەهات بەرزتر دەبوومەوە، تا لە ڕێژەی بەرزیی نرخی خەڵووز و کرێخانوو و تەنانەت هی خواردەمەنییەکانیش کە مەگەر هەر خوا بزانێ چۆن چوونەتە سەرەوە، تێپەڕم کرد و

بەرزتر بوومەوە... هەروا لە بەرزبوونەوەدا بووم لە ناکاو هەستم کرد ئەو چرە دووکەڵەی ناو جەستەم وردە وردە لە کونە گەورە و بچووکەکانی لەشمدا دەچێتە دەرەوەو من بەتاڵ دەبمەوە. لە دۆخێکی زۆر ناڵەباردا بووم... نەمدەزانی ئەگەر هەموو دووکەڵەکە لە جەستەم بچێتە دەرەوە، چۆن دەتوانم لەو سەرەوە خۆم ڕابگرم؟ هەرچی هەوڵێشم ئەدا کونەکان پڕ بکەمەوە نەمدەتوانی، ئاخر تیری قەرز کوێری پێکابوومی، هەموو ئەندامم شڕ و شیواڵ ببوو و پڕکردنەوەی ئەو هەموو کونە گەورانەش بە من نەدەکرا.

دەمزانی ئەوەندەی تر نابات دوکەڵەکە تەواو دەبێت و من لەو سەرەوە دەکەومە خوارەوە و دیسانەوە گیرۆدەی دەستی دوکاندار و قەساب و نانەوا و لە هەموویش خراپتر هی دەستی خاوەن ماڵ دەبمەوە، بۆیە دەستم کردە هاوار کردن و تا هێزم تێدا بوو قیڕاندم: ئەی هاوار... بگەنە فریام... بایەکەم خەریکە خاڵی ئەبێتەوە فریام کەون... ئەی هاوار...

- کوڕە تۆزێك دان بە خۆتدا بگرە.. تۆ هاتوویتە ناو مانگ.

- کوڕە کونەکانی لەشم هەر گەورەتر ئەبن... هەر ئێستا دەکەومە خوارەوە بگەنە فریام... ئەگەر بە خۆم ڕەحم ناکەن بەزەییتان بە منداڵە وردەکانما بێتەوە... کوڕە تکایە.

- ئێوە گەیشتوونەتە هەسارەی مانگ، هەر ئێستا دوو کیسە دووکەڵی کەشتیتان بۆ ڕەوانە دەکەین، تکایە بە گەیشتنی دووکەڵەکە ئاگادارمان بکەنەوە!... لە ناکاو بە گەیشتنی دووکەڵەکە، کە وەکو یارمەتیی برێ وڵات پێشکەشی هەندێ وڵاتی تر دەکرێت و ئەوان شاد و خۆشحاڵ دەکاتەوە، منیش هاتمەوە سەرخۆ و بەڕاستی هەستم کرد گەیشتوومەتە ناو هەسارەی مانگ. لەوێ خەڵکێکی زۆر دەورەیان دام ،کە هەمووشیان لە خەڵکی سەر زەوی دەچوون:

- بەخێر بێی

- زۆر سوپاس

دواتر سواری تەیارەیەکیان کردم و لە چاوتروکانێکدا بردمیانە شارێکی گەورە و دایان بەزاندم و بردمیانە ناو کۆشکێکی هەرەی ڕازاوە،کە بەسەر دەرگاکەیەوە نوسرابوو: ((زانکۆی هەسارەی مانگ)). من هەوڵم ئەدا قسەیان لەگەڵ بکەم ،کەچی ئەوان گوێیان نەدەدامێ و هەر دەیانگوت:

- ئێره گۆی زەوی نییه و هیچ کارێکیش تەنها به قسه ناکرێت. تکایه بێدەنگ بەو کاتی ئێمەش به قسەی پڕوپووچ به فیڕۆ مەدە. پاشان گورج بردمیان بۆ هۆڵێکی گەورەی شانۆ که له زەوی داخراوی فتبۆڵی لای خۆمان دەچوو. ئەوەندەی خەڵك تێداکۆ ببۆوه، سەرسامی کردم. له دڵی خۆمدا گوتم: - ئەمانەش هەروەك بینەرانی کێبڕکێی فتبۆڵی لای خۆمانن و تەنیا جیاوازییان ئەوەیه، که بێدەنگ له جێی خۆیان دانیشتوون و جناو نادەنه دایك و باوکی یەکدی.

کابرایەك، که دواتر تێگەیشتم مامۆستای زانکۆیه، دەستی بۆ من ڕاکێشا و ڕووی کرده خەڵکەکه و گوتی: - هەروا که له وانەی پێشوودا پێم گوتن، گیانلەبەرەکانی گۆی زەوی! هەروەك ئەوه وان و ئەم گیانلەبەرەی که له لاتان دانیشتووه یەکێکه لەوان... ئێستا به دیتنی ئەم گیانلەبەرەی سەر زەوی جارێکی تر وانەی پێشوو دووباره دەکەینەوه:... گیانلەبەرەکانی سەر زەوی وا ئەزانن گۆی مانگ له هەسارەی زەوی جیا بۆتەوه له حاڵێکدا به پێچەوانەی ڕاو بۆچوونی ئەوانه و هیچی وا نییه ئەوان ئەیڵێن... پەنجا هەزار ساڵ لەمەوپێش ڕادەی شێت و گێل و نەفام له ناو هەسارەی مانگدا زیادی کرد و ڕۆژ به ڕۆژیش ڕێژەیان زۆرتر دەبوو. بەڕێوەبەران بۆ کۆکردنەوەی ئەو هەموو شێت و نەفامگەله چەندین شێتخانەیان بینا کرد کەچی، هیچ سوودێکی نەبوو، له لایەکیشەوه هەڵسوکەوتی چەوت و نالەباری شێتەکان ئاکار و کردەوەی جیلی گەنجی ئێمەی دەخسته مەترسییەوه و پیرەکانیشی شێت دەکردن.. بۆیه له شار دووریان خستنەوه، بەڵام ئەو کارەش هیچ سوودی نەبوو، سەرەنجام هاتنه سەر ئەو ڕایەی که هەموو شێت و گێل و گەوجەکان دەر بکەن بۆ هەسارەیەکی تری دوور له هەسارەی مانگ. ئەوەبوو که هەرچی شێت و گێل و گەوج بوو هەموویان کۆ کردنەوه و ڕەوانەی هەسارەیەکیان کردن که ناوی زەوی بوو، ئەوێیان کرده شێتخانەیەکی گەوره و پان و بەرین و هەر لەو کاتەشەوه ئێمه پەیوەندیمان لەگەڵ ئەو هەسارەیەدا پچڕاند و ئەوانمان له ناو هەوایەکی پڕ له گازی جۆراوجۆری کوشنده و خنکێنەر جێهێشت بۆ ئەوەی زووتر له ناو بچن و ئێمەش له دەستیان ڕزگار ببین.

ئەو خەڵکەی تا ئەو کاته بێدەنگ دانیشتبوون، له ناکاو تووڕه بوون و هەستانه سەر پێ و به مستەکۆڵه ڕوویان له من کرد و یەکدەنگ هاواریان کرد:

- هۆی، شێت و هار... هۆی دەرداوی.. گورج لەم هەسارەیەی ئێمه دەرچۆ...

مامۆستا ئەوانی هێورکردەوەو درێژەی به قسەکانی دا:

- ئەڵبەت کاتێ شێتەکانیان لە مانگەوە بۆ زەوی دەگواستنەوە، بە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، چەند کەسێکی ئاقڵیشیان تێکەڵ کردبوون و ناردبوونیان. ئەوەتە کە ئێستا منداڵەکانیان هەندێ کردەوەی ژیرانەیان لێ دەوەشێتەوە کە لە چاوی شێتەکاندا شێتانەیە، واتە شێتەکانی سەرزەوی ئەو منداڵە ژیرانە بە شێت دەزانن و دەیانخەنە ناو ئەو شێتخانانەی کە خۆیان دروستیان کردوون.

جەماوەرەکە زۆر تووڕە ببوون و هەستیان جووڵابوو. بۆیە لەسەریەك هاواریان دەکرد:

- بیکوژن... لە قەنارەی بدەن... هەنجن هەنجنی کەن....

لە چاو تروکانێکدا ئەو ئارامی و بێدەنگییە شێوا. هەموویان هەڵمەتیان هێنایە سەر من و بەرۆکیان گرتم و ئەوەندەیان گوشی، کەوتبوومە هەناسەبڕکێ و نزیکبوو بخنکێم. خەریك بوو دوایین هەناسەم دەدا، یەکێك لە منداڵەکانم ڕایچڵەکاندم و گوتی: بابە گیان سەرت لە سەرینەکە ترازاوە و کەوتبوویتە پرخەپرخ... جێی سەرت بگۆڕە. بە هەزار حاڵ توانیم لەو خەوە ترسناکە ڕاچەنم. کە جوان هاتمەوە سەر خۆم هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و لە ناخەوە گوتم:

- ئۆخخخەی... وڵاتە خۆشەویستەکەم، تۆ چەندە جوان و ڕازاوەیت!.

# کوودی شیمیایی

پاش خوێندنەوەی سرودی نەتەوەیی هەردوو وڵات و ماوەیەکی دوور و درێژ لێدوان و گفتوگۆی ڕەسمی، چەند تەن کوودی شیمیایی تەرخان کرا بۆ دابەشکردن بەسەر گوندنشینەکاندا. کاتێ هەواڵی دابەشکردنی ئەو کوودە بەسەر گوندەکاندا بۆ بەهێز کردنی درەخت و کشتوکاڵ، لە ڕادیۆدا بڵاوکرایەوە و ڕاگەیەنرا، بەڕێوەبەری فەرمانگە، جێگرەکەی خۆی بانگ کرد و پێی گوت:

- جەنابی وەزیر ئەمری کردووە بەجوانی لەو کوودە چاودێری بکرێ بۆ ئەوەی لە ناو نەچێت و لێی کەم نەبێتەوە یان نەکەوێتە دەستی دەڵاڵەکان.

- بە چاوان گەورەم... من خۆم چاودێری ئەکەم.

کاکی جێگریش تەلەفۆنی بۆ یاریدەدەرەکەی کرد و پێی گوت: - ماوەیەکی زۆرە دەمویست ئەرکێکی گەورەت پێ بسپێرم... ئێستا کاتی گەیشتووە.

- سوپاستان ئەکەم گەورەم... من هەردەم لە خزمەت ئێوەدام.

- ئەمڕۆ ئەمەوێ کارێکی گرینکت پێ بسپێرم با تۆش ئەوەندە بەتاڵ نەبی.

- زۆر سوپاس... من بۆ جێبەجێکردنی ئەمری جەنابتان هەردەم ئامادەم و هیوادارم بتوانم ئەو ئەرکەی کە پێمی دەسپێرن بە جوانی بەڕێوەبەرم.

- گوێبگرە، پێویستە لەو کوودە شیمیاییەی کە وەك یارمەتی بە وڵاتەکەمان بەخشراوە بە جوانی چاودێری بکەیت و بیدەیتە ئەو گوندانەی کە ناویان نووسراوە، بەڵام ئاگادار بە، لە ٥٠ کیسە زۆرتر نەدەیتە هیچ گوندێك.

- بەسەرچاو گەورەم... بە زووترین کات دەیگەیەنمە دەستی گوندنشینەکان و دواییش بەڕێزتان لە ئەنجامی کارەکە ئاگادار دەکەمەوە.

- زۆر باشە، بەڵام داوات لێدەکەم چ لە عەمبارەکان و چ کاتی گواستنەوە و دابەشکردن، بە جوانی هۆشت پێوەی بێت و چاودێری بکەیت و نەیەڵی بکەوێتە دەستی دەڵاڵەکان و ساتوسەودای پێ بکرێت.

- گەورەم لەو بابەتە دڵنیابە و هیچ خەمت نەبێت.

- خۆت دەزانی ڕۆژنامەکان بۆ بیانوویەك دەگەڕێن تا هەڵەیەکی بچووك گەورە بکەنەوە... ئەگەر ئەم کوودە نەگاتە دەستی وەرزێرەکان و لە بازاری ڕەشدا ببینرێت، ئەوا ڕۆژنامەکان دەسبەردارمان نابن.. دەیکەنە هەڵلا و حەیامان بۆ ناهێڵن.

- گەورەم هیچ خەمت نەبێ نایەڵم شتی وا ڕوو بدات.

- نامەوێ بۆ هیچ کەسێك، تەنانەت خۆم یان بەرپێوەبەریش لە ڕوو دابمێنی... تەنانەت مسقاڵێکیش لەو کوودە بێجگە لە وەرزێرە زەحمەت کێشەکان نابێ بدرێتە هیچکەسی دیکە.

- بەڵێ گەورەم بەڵێنتان پێدەدەم.

- من دڵنیام ئێوە ئەرکەکەتان بە جوانی بەرپێوەدەبەن... ئیتر بڕۆن و دەستی پێ بکەن.

یاریدەدەری کاکی جێگر، لەبەرئەوەی خۆی نەیدەتوانی بە تەنیایی کاروبارەکە ئەنجام بدات. کارگێڕێکی فەرمانگەکەی بانگ کرد کە لەگەڵ گوڵکاری و کشتوکاڵدا سەروکاری هەبوو، پێی گوت:

- کاروباری گواستنەوە و دابەشکردنی ئەو کوودە بەسەر گوندەکاندا بە تۆ دەسپێرم و دەمەوێ تەنانەت مسقاڵێکیشی لە ناو نەچێت... خۆشم هەر لە نزیکەوە چاودێری ئەکەم.

- بە چاوان گەورەم هەوڵ ئەدەم بە تەواوەتی بگاتە دەستی وەرزێرەکانمان کە پێویستی زۆریان پێیەتی.

- باشە سەرکەوتوو بیت... بەڵام، تۆزێ ڕاوەستە

- فەرموون گەورەم

- کە ڕۆیشتیتە عەمبار سەیرێکی کیسەکان بکە، ئەگەر بینیت یەکێکیان کون بوو، تۆزێکی لێ دەربێنە بۆ گوڵخانەکەیماڵەوەمان.

- به سەرچاوم گەورەم... ئەگەر نەدرابێتیش کیسەیەك ئەکەمەوە و نەك تۆزێ بەڵکو ئەگەر بفەرموون دە کیسەیش ئەنێرمە ماڵەوە... کوود چ نرخێکی هەیە لەبەرامبەر گەورەیی بەڕێزتاندا.

- سوپاس، بەڵام زۆر داکۆکی ناکەم... ئەگەر کیسەیەك درابوو ئینجا لێی دەربێنە، ئەویش لەبەرئەوەیە کە باخچەوانەکەم زۆر دەمێکە داوای کوودی شیمیایی دەکات.

- خاترت جەم بێ گەورەم... دڵنیابە وا دەکەم.

- دەی باشە برۆ بەڵام دیسان دەڵێمەوە، نابێ تۆزقاڵێکیش لەو کوودە لە ناو بچێت و لە وەرزێرەکان دریغ بکرێت.

- هیچ خەمت نەبێ گەورەم... هەرکەس گەر بەلاچاویشەوە بۆی بڕوانێ چاوی دەر دێنم. کارگێڕ، کە لە هەمانکاتدا عەمبارداری دایرەش بوو، بە فیز و دەمارێکەوە لە ژووری یاریدەدەر هاتە دەرەوە و هاوکارەکەی بانگ کرد و پێی گوت: - پێویستە هەموو ئەو کوودە تەنیا بەسەر فەلاکانی ئەو گوندانە دابەش بکەیت کە ناویان نووسراوە و نەهێڵی کەسی تر دەستی بۆ بەرێت.

- بەچاوان گەورەم.

- دەی برۆ گورج دەستی پێبکە. بەڵام تا لە بیرم نەچووە با پێت بڵێم... کە چوویتە عەمبار، کیسەیەك دانێ بۆ ماڵی کاك مورتەزا، کیسەیەکیش بۆ گوڵخانەی ئیدارە، نیو کیسە بۆ ماڵی خۆمان و نیو کیسەیش بۆ ماڵی ئەو بێ نامووسە بنێ لاوە.

- کام بێ نامووس گەورەم... حەمید ئاغە ئەڵێی؟

- نا کوڕە ئەو ناڵێم

- ئەی مەبەستت ئاغە ڕەزایە یان سمایل خان؟

- ئۆهۆ... و، ئەبێ بۆ ئەوانیش بنێرین... باشە بۆ هەموو ئەوانیش سێ کیسە دانێ با لەگەڵ ئەوانەی لای خۆماندا سەرجەم ببێتە شەش کیسە.

هاوکاری عەمباردار یەکێك لە دۆستە هەرە نزیکەکانی خۆی بانگ کرد و پێیگوت:

- حەز دەکەم کارێکت پێ ڕاسپێرم... ئەویش دابەشکردنی کوودە بەسەر وەرزێرە گوندنشینەکاندا. بەڵام لە بیرت بێ چاوپۆشی لە مافی کەس نەکەیت و بەشی زۆرتر

نەدەیتە لایەنگرانی حیزبەکەی لای خۆتان... تەنانەت ئەگەر باوکیشت زیندوو بێتەوە زۆرتر لە ڕێژەی دیاریکراوی نەدەیتێ.

- بەسەرچاو... دڵنیابە بە جوانی دابەشی دەکەم.

- بەڵام لە بیرت نەچێ، بەر لە ناردنیان ١٥ کیسەیان لێ جیا بکەوە و لە عەمبار داینێ و ئەوی تر بە یەکسانی دابەش بکە بەسەر هەموو گوندەکاندا.

دۆستی نزیکی هاوکاری عەمباردار پاش قسە کردن و لێدوان بە دوور و درێژی لەسەر کارەکە بە یەکێ لە کرێکارەکانی عەمباری گوت:

- لەو کوودە ٢٥ کیسە بە جیا دانێ و ئەوی تری بنێرە بۆ گوندەکان... دەمەوێ لەم کارەدا زەحمەتی زۆر بکێشیت و سەرنج بدەی تەنانەت بۆ دەرمانیش کەسی تر لێی هەڵنەگرێت.

- بەچاوان گەورەم

- دەی چیتر دوا مەکەوە و بڕۆ بگە بە کارەکەتدا.

* * *

تەلەفۆنی ژووری حیلمی، بەڕێوەبەری گشتیی دابەشکردنی کوودی شیمیایی لێیدا. کە هەڵیگرت، بینیی وەزیری کشتوکاڵە. بۆیە لەبەر دەنگەکەی هەستایە سەرپێ و لە دوورەوە کڕنۆشی بۆ برد. وەزیری کشتوکاڵ لێی پرسی:

- وابزانم کوودەکە گەیشتووە؟

- بەڵێ گەورەم

- بەشی باخچەکانی منت جیا کردۆتەوە؟

- بەڵێ گەورەم ٢٥ کیسەم لێ جیا کردۆتەوە... ئەگەر کەمە باهەندێکی تری بخەمە سەر.

- نا... بۆ من بەسە، بەڵام ٣٠ - ٣٥ کیسەیەکیش دابنێن بۆ دۆست و ئاشناکانمان.

- بەسەرچاو گەورەم هەرچی ئێوە بفەرموون وائەکەم.

پاش تەواو بوونی قسەکانی وەزیر، ئاغەی حیلمی نوێنەرەکەی خۆی بانگ کرد و گوتی: - ٧٠ کیسە هەڵگرە بۆ جەنابی وەزیر ودۆستەکانی، ٢ کیسە بۆ بەڕێز حەقی و ٤ کیسەش بۆ جەنابی...

- جەنابی کێ گەورەم؟
- ئەو دۆستەی کە دووجار تەلەفۆنی کردبوو، ناویم لە بیر نەماوە.
- باشە گەورەم
- ٣ کیسە جیا بکەوە بۆ فلانەکەس!
- بەسەرچاو گەورەم
- بەڵام جوان سەرنجی کارەکە بدەن... نابێ کیسەی دڕاو دابنێن.
- دڵنیابن گەورەم... من خۆم بەسەر کارەکەوە دەبم و چاودێری ئەکەم.
- وەخت بوو لە بیرم بچێ... خاتوو (نازی)ی لای منیش داوای کردبوو... کیسەیەکی گەورە بۆ ئەویش دابنێ.



ناوی ئەو گوندنشینانەی کە دەبوو کوودی شیمیایی وەر بگرن، لە چوار لاپەڕەی گەورەدا نووسرابۆوە. نوێنەری بەڕێوەبەر سەیرێکی لیستەکەی کرد. بینی ناوەکان زۆرن و کوودیش کەمە. بەڕادەیەك ئەگەر بۆ هەر گوندێك تەنانەت هەشتیەکی کیسەیەکیش بنێردرێت، هێشتا هەر کەمە و بە هەموویان ڕاناگات. هەر بۆیە بۆ پێشگریکردن لە دزی و دەستێوەردانی تر، دوو کیسە و دوو بەرمیلی پڕی ناردنەوە بۆ ماڵ و ئەو تۆزەشی کە مابووەوە دابەشی کرد بەسەر ٢٧ ئاواییدا کە بە ڕای خۆی لە هەمووان زۆرتر پێویستیان پێی بوو. بەشی هەر گوندێك نەدەگەیشتە کیلۆیەك، بۆیە کاکی نوێنەر هاتە سەر ئەو ڕایەی کە بەشی هەر دێیەك بکاتە ناو زەرفێکی یەك کیلۆیی و بۆیانی ڕەوانە بکات.

کەیخودای گوندێك، هەر کە چاوی بە زەرفی کوودەکە کەوت، دانیشتوانی ئاوایی لەبەردەرگای مزگەوتدا کۆکردنەوە و دەستی کردە قسە و ڕاوێژکردن:

- دۆستانی خۆشەویست... ئەمڕۆ پیرۆزترین ڕۆژی ژیانی ئێمەیە، چونکە لە پەیوەندی لەگەڵ پلانی ئاوەدانکردنەوەی گوندەکاندا یەکەمین بەری کوودی شیمیاییمان

پێگەیشت. پێویستە پێتان بڵێم هەموو گیروگرفتەکانمان لە سای ئەم زەرفە یەك کیلۆییەدا چارەسەر دەبن، مانگاکانمان ٥ هێندە شیریان زیاددەبێت، بەر و بەرهەمی باخەکانمان زۆرتر دەبێت و منداڵەکانمان لە نەخۆشی ڕزگار دەبن. پاشان کەوچکێکی بچکۆلەی لە گیرفانی دەرهێنا و گوتی: - ئەم شتە سپییە دەوای هەموو دەردێك و شیفای هەموو نەخۆشینێکە. تکایە بە پشتسەری یەکترەوە ڕاوەستن و سەرە بگرن بۆ ئەوەی هەرکامەتان کەوچکێك کوودتان بگاتێ.

کەیخودای ئاوایی، بێ ئەوەی مافی هیچ کەسێك پێشێل بکات، بە بێ هیچ فەرق و جیاوازییەك، هەرکامە و پڕی کەوچکێکی بچکۆلەی کوودی شیمیایی پێدان. دوابەدوای تەواوبوونی ئەرکی دابەشکردنی کوودەکە وەرزێرێك لە چۆنیەتی بە کار هێنانی پرسی. کەیخودا ڕووی لە خەڵکەکە کرد و گوتی: بەڕێزان، من بیری هەموو شتێکم کردبۆوە بێجگە لە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم کوودە، هەر بۆیە داواتان لێدەکەم دەستی لێمەدەن تا من بڕۆمە شار و شێوەی گرتنەوەی فێر ببم، ئەنجا کە گەڕامەوە پێتان دەڵێم چۆنی بگرنەوە و چۆن بیخۆن، پێش نان یا دوای نان خواردن!!!.

# دوایین نامەی لۆمۆمبا

لەسەر ئەم گۆی زەوییەدا هەموو ڕۆژێك بە هەزاران چەشنە فڕوفێڵ و درۆ و دەلەسەی سەرسوڕهێنەر دەکرێ... ئەوانەی بەسەر خەلکی ترەوە ژیان ڕائەبوێرن و هەروەها ئەو کرمانەی کە بە دەستی بەرە دواکەوتووەکان لە کۆمەڵدا درێژە بە ژیانی نەفرەتباریان دەدەن، بۆ ئەوەی چاو و گوێی مرۆڤە دواکەوتووەکان نەکرێتەوە و نەتوانن ڕاستییەکان ببینن، هەموو قسەکانی خۆیان لەبیر بردۆتەوە و تەنانەت زۆر جاریش بە پێچەوانەی گفت و بەڵێنی خۆیان دەجولێنەوە... لەو ڕێگەیەشدا لە سووکایەتی پێکردن و تۆمەت بۆ هەڵبەستن و لەکەدار کردنی شەرەف و ئابڕووی خەلك درێغی ناکەن... بۆ بەرژەوەندیی خۆیان مرۆڤە بە شەرەفەکان وەك خائین و تاوانبار و پیاو خراپ لە قەڵەم دەدەن و بە پێچەوانەوە پیاو خراپ و مرۆڤە سووك و ڕسوایەکان وەك پیاو چاك و مرۆڤی شەرەفمەند بە کۆمەڵ دەنوێنن، بە کورتی، ڕاستییەکان درۆ و درۆیەکانیش بە ڕاست دەرخواردی جەماوەر دەدەن... وڵاتپەروەرە ڕاستەقینەکان بە ناوی کرێگرتەی بێگانە و مارە خۆڵێنەی ناوخۆ و دوژمنی وڵات و، لە هەمان کاتیشدا بە کرێگیراوەکانی خۆیان بە ناوی وڵاتپارێزی ڕاستەقینە لە قەڵەم دەدەن. مەسەلەیەك هەیە ئەڵێ :(ئێمە لەم جیهانەدا بەسەر دوو پێی خۆمانەوە نەوەستاوین بەڵکو سەرمان لە زەوییە و قاچمان کردووەتە ئاسمان، هەر بۆیە هەموو شتێك ئاوەژوو دەبینین) ئەڵبەت ئێمە ئاوەژوو نابینین، بەڵکو ئەوە ئەوانن هەموو شتێکمان بە پێچەوانە پیشان دەدەن. ئەم کرمانەی ناوخۆ و دەرەوە بۆ ئەوەی جەماوەر فریو بدەن و خەوی قورسیان لێ بخەن، هەر چەشنە هۆکار و ئامێرێکی وێرانکەر بەکاردێنن ،کە ببێتە هۆی دواکەوتنی کۆمەڵ. هەر بەم بۆنەیەوە ئێمەش بۆ ئەوەی لە ڕووداوەکان تێبگەین و بتوانین چەوت لە ڕاست و چاك لە خراپ و هەڵە لە دروست لێك بدەینەوە و فریو نەخۆین، دەبێت هەوڵ بدەین ئەقڵ و ئەندێشەی خۆمان بخەینەگەڕ، لەسەر

مەسەلەكانی ڕۆژ بە وردی بكۆڵینەوە، هەرچەند ئەمە كارێكی ئاسان نییە و زۆریش سەختە... هەمیشە ساویلكەیی و فریو خواردن زۆر لە وشیاری و خۆ پارێزی ئاسانترە!...

پاتریس لۆمۆمبا كە بۆ ڕزگاری گەلی كۆنگۆ خەباتی دەكرد كوژرا. لۆمۆمبا گیانی لە پێناو ڕزگاری و سەربەخۆیی گەلەكەیدا بەختكرد. ئێمە چاك لە واتای ڕزگاریی گەل تێدەگەین... ئەو كاتەی كە باپیرانمان لە بەرامبەری داگیركەرە ملهوڕەكان و كرمەكانی ناو كۆمەڵ بۆ ئازادی و سەربەستی وڵات خەباتیان دەكرد، منداڵەكانمان لە مەمكی وشكی دایكیان لە جێی شیر خوێنیان دەنۆشی... ئەوەیە كە دەردی لۆمۆمبا و هاووڵاتییەكانی هەست پێدەكەین و جوان لێی تێدەگەین و هەروا لە فرِوفێڵی كرمەكانی ناوخۆیش بە تەواوی ئاگادارین... ئەم هاودەردییە باشترین هۆی تێكەڵاوی و لێك نزیكبوونی دوو گەلی ستەمكێش و زۆر لێكراوە و ئاشكراترین وەڵامیشە بەو پرسیارەی كە: (بۆچی ئێمە لۆمۆمبامان خۆشدەوێت؟)...

گۆڤارێكی تونسی دوایین نامەی پاتریس لۆمۆمبای بڵاوكردووەتەوە، كە چەند ساتێك پێش كوژرانی لە بەندیخانەدا بۆ هاوسەرەكەی نووسیبوو. بەلای سەرووی نامەكەوە وێنەی ژنێكی ڕەش پێست چاپكراوە ،كە قژی ئاڵۆزە و منداڵێكی لە ئامێزدایە و ئەگری، لەوانەیە وێنەی هاوسەری لۆمۆمبا بێت یان بگرە سیمبولی دەرد و ڕەنج و مەینەتی نەتەوەیەك... لێی گەڕێین، نامەیەك كە بۆ خێزانی لۆمۆمبا نووسراوە هێندە قووڵ و پڕ واتا و دڵتەزێن و هەست بزوێنە كە هیچ كەس (ئەگەر تۆزقاڵێ هەستی جوامێری و مرۆڤایەتیی لە دڵدا بێت) ناتوانێ پاش خوێندنەوەی لە ناخی دڵەوە نەگری و فرمێسك نەڕێژێت..

ئەمەش دەقی نامەكەی لۆمۆمبایە كە لێرەدا ئاراستەی خوێنەرانی بەڕێزی دەكەم: ...

" هاوسەری خۆشەویستم..

كاتێ ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە كە نازانم لەم دنیایەدا ماوم یا نا، لەوانەشە ئەم نامەیە هەرگیز نەگاتە دەستت. كاتێ بۆ ڕزگاری وڵات خەباتم دەكرد، بۆ ساتێكیش لە سەركەوتنمان لەم خەباتە پیرۆزەدا دوودڵ نەبووم. من و هاوڕێكانم ژیانی خۆمان كردە فیدای ئەو خەباتە پیرۆزە، ئێمە تەنیا شتێكمان دەویست.. دەمانویست خەڵكی وڵاتەكەمان وەك مرۆڤی ڕاستەقینە، بە سەربەرزی و شەرەفمەندی بژین، بەڵام داگیركەرانی ملهوڕی بەلجیكی پێچەوانەی ئەو ئاوات و خواستە ڕەوایەی ئێمەیان دەوێ، هەڵسووڕێنەرانی هیچ لێنەهاتووی كۆمەڵەی نەتەوە یەككگرتووەكانیش لەوان خراپترن و كەمترین بایەخ بە ئێمە و خواستە

ڕەواکانمان نادەن. هەندێك لە هاووڵاتییەکانی ئێمەیان هەڵخەڵەتاندوون و لە ڕێ بەدەریان بردوون. هەندێکیشیان بە پارە کڕیون بۆ ئەوەی ڕاستییەکان بشێوێنن و خواستەکانی ئێمە سووك و بێ نرخ بکەن. هەرچی لە دەستیان هاتبێ کردوویانە..

دەمەوێ بڵێم، ئەگەر بمرم یا بمێنم.. ئەگەر ئازادم بکەن یانخود تا دوایین کاتی ژیانم هەر لە کۆت و بەندا بم، هیچ بۆم گرنگ نییە و هەرگیز لە بیروبڕوا و مەبەست و ئامانجی خۆم پاشگەز نابمەوە. تەنیا خواست و ئاواتی من ئازادیی کۆنگۆ و ڕزگاربوونی گەلی ستەم لێکراوی ئەم وڵاتەیە کە خەریکە لە ژێر پۆستاڵی ڕەشی دوژمندا دەپلیشێتەوە. بەڵێ تەنیا بیروبڕوام هەر ئەوەیە و لە پێناوی ئەم خواستە پیرۆزەشدا گیانی من و هاوڕێکانم هیچ بایەخێکی نییە. با دۆست و دوژمنم ئەوە بزانن کە یەکبوون و تێکەڵاویم لەگەڵ میللەتدا نەبڕاوەیە و کوشتن و لە سێدارەدان و هیچ فێڵ و تەڵەکەیەکی تریش زەڕەیەك لە باوەڕم بە گەلی کۆنگۆ کەم ناکەنەوە. لە ناخی دڵمەوە گوێم لێیە و هەست دەکەم کە گەلەکەمان سەردەکەوێت و دوژمنانی ناوخۆ و دەرەوەش لە ناو دەبات.. لە ناو ئەم گەلەی ئێمەدا مرۆڤی بە شەرەف و جوامێری وا پەروەردە ئەبن کە پێش بەم دوژمنانە بگرن و دەمکوتیان بدەنەوە و سەرکوتیان بکەن.. ڕۆژێك دادێ کە میللەتی ئێمە ژیانی ئازاد و بەختەوەرانە دەست پێدەکات و مافی ڕەوای خۆی لە دوژمنی داگیرکار دەستێنێ.. تەنیا ئێمە نین، هەموو گەلانی ئاسیا و ئەفریقیا و زۆربەی دنیاش ڕۆژێ سەردەکەون و زنجیری ستەم دەپسێنن.. ئێمەش لەگەڵیان هەنگاو دەنێین و دەتوانین چەکدارە جیرەخۆرەکانی بێگانە کە ئێستا وڵاتیان داگیرکردووە لە ناوبەرین و لە گۆڕیان نێین... بە ڕۆڵەکانم کە پاش خۆم دێنە دنیا و من نایانبینم دەڵێم: (ڕۆڵە خۆشەویستەکانم، ڕۆژە ڕووناکەکانی کۆنگۆ لە داهاتوودا ئەگەن، خواست و مەبەستی هەریەکە لە ئێوە ئەبێ ئازادی و سەربەستی کۆنگۆ بێت. تێبکۆشن لە بەرامبەر زۆرداران و ستەمکاران و هەموو ئەوانەی کە چاویان بریوەتە ئاو و خاك و ماڵ و سامانتان خەبات بکەن و بۆ ساتێکیش مەوەستن.).

هەرچەندە ئازار و ئەشکەنجەم بدەن لە بەرامبەری دوژمنانی وڵاتدا چۆك ناناد‌ەم... مردن بۆ من باشتر و شیرینترە لە ژیان بەسەرشۆڕی.. هیچ کەس و هیچ شتێك ناتوانێ لام پێ بدا لە خۆشەویستی و عەشقی نیشتمانی پیرۆزم.. لە پێناو دوارۆژی ڕووناکی وڵات ئەگەر مەحکومیش بکرێم، بە سەر بەرزی بەرەو پیری مردن ئەڕۆم.. ڕۆژێ ئەگا، کە مێژوو کرمگەلی ناو کۆمەڵ ڕیسوا ئەکات.. ئەوەش ڕۆژێکە کە پیشانی کۆشك نشینەکانی بڕۆکسڵ

و دۆستەکانیان دەدەین چۆن لە دەستی نۆکەر و بووکەشووشەکانیان ڕزگاربووین و شەڕ و خراپەمان لە وڵاتەکەماندا بنەبڕ کرد... ڕۆژێك ئەگا کە ئەفریقیا مێژووی خۆی دەنووسێتەوە و ئەوسا مێژوویەکمان دەبێت ،کە لە خۆرهەڵات و خۆراواشدا شانازیی پێوە دەکەین..

بۆ من مەگرین، فرمێسك مەڕێژن.. من دڵنیام و خاترم جەمە کە گەلەکەم بۆ ئازادی وڵاتە ڕەنجکێش و ستەم لێکراوەکەمان ڕادەپەڕن...

بژی کۆنگۆ... و... بژی ئەفریقیا

(پاتریس لۆمۆمبا )"

بەڵێ... ئەم کرمە کرمۆڵە ناوخۆ و دەرەکییانەی کە لۆمۆمبای شۆڕشگێڕیان کوشت، بۆ فریودانی گەلانی جیهان، پشتەسەری مەیتەکەشی هێشتا لە درۆ و فڕوفێڵ و تاوانبار کردن دەستیان هەڵنەگرت. تاوان پێوە لکاندن و درۆ هەڵبەستن، خنجێری نامەردەکان... درۆزنەکان... ترسنۆك و خەتاکار و تاوانبارەکانە. بەداخەوە گەلانی دنیاش هێشتا بە تەواوەتی پێ نەگەیشتوون و هەندێکیان زوو فریو دەخۆن و ئاسان هەڵدەخەڵەتێن.

## بەڵێ گەورەم ... بەچاوان گەورەم

حسەین ئاغە لەپشتی مێزەکەیەوە دانیشتبوو. هەروا کەخەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕەی دەفتەرەکەی بوو، لەگەڵ خۆیدا خورتە و بۆڵەی دەهات... ((کابرای کەران باوك ئامۆژگاریی هەموو کەس دەکا بۆ چاکەکاری، کەچی خۆی کەلوپەلەکان دەشارێتەوە و دەبێتە هۆی گرانی. منی بێچارە بەیانی تا ئێوارە ئەبێ خۆم هیلاك بکەم و سەری مانگیش هەقدەسێکی کەم و بێ نرخ وەربگرم ئەویش بەهەزار منەت. بەڵام ئەو ئەربابە خوێڕییە هەر بە تەلەفۆنێك بۆئەنکەرە سی چل هەزار لیرە قازانج ئەکا. ناکەس، نازانم ئەو هەموو پارەیەی بۆچییە؟ لەم وڵاتە کەس نەماوە ئەم بێناموسە نەیخەڵەتێنێ، کەران باوکە تەنانەت حکومەتیش هەڵدەخەڵەتێنێ... جا بەیانی تائێوارەش تەسبێحەکەی بەدەستەوەیە، بەسەر کەتەکەوە چینچکی داوەو زیکر ئەکات! زۆر حەز دەکەم هەڵێك بڕەخسێت و ئەم قسانەی پێ بێژم... ساڵەهایە ئەم هەموو ناپیاوییەی لێ ئەبینم و نەموێراوە فزە بکەم. بەڵام ئیتر تاقەتم تاق بووە.هەر ئا ئەمڕۆ ئەچمە دەفتەرەکەی و هەموو قسەکانی پێدەڵێم.. پێیدەڵێم: ((ئەرێ کابرای ناکەسی نامەرد، بۆ لەدز و جەردە و ڕێگرەکانیش خراپتری ...؟)).. بۆ ... چی دەبێت؟ ... پیاو نابێ لەئاوەها دزێکی بێ شەرەف بترسێ. ئەگەر فزە بکا، هەموو دزی و ناپیاوییەکانی دەخەمەڕوو. باش لەهەموو سڕ و ترێکی ئاگادارم، تفی لێدەکەم. ئەڵێم تا ئێستا بێناموسێکی وەك تۆ لەدایك نەبووە.

کاتێ ئاوا لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد، ئەو حاڵەتە هێندە کاری لەسەر کردبوو ،کە نووکی قەڵەمەکەی وا دا بەسەر مێزەکەیدا، شکاندی. لەم کاتەدا دەنگی ئەرباب لەژووره شووشەییەکەدا بەرزبووەوە...

— حسەین ئاغە...
— بەڵێ گەورەم...
— زوو وەرە ئێرە...
— بەچاوان گەورەم...

حسەین ئاغە سەر و وەزعی خۆی دروست کرد و چووە لای ئەرباب...

— ئەمر فەرموون گەورەم...
— ئاسنەکانیان لەگومرك بەردان؟
— چی گەورەم؟
— چی گەورەم و قوزەڵقورت، پرسیم ئاسنەکانیان بەردان یا نا؟
— گەورەم ئیزن بدەن لیستەکە ببینم.
— ئەی من پێم نەوتی ئاسنەکان بنێرە بۆ (ویسو)؟ تۆ بۆچی ئەوەندە کەری؟ تەواو ڕقم هەستاوە و لێت بێزارم...
— تووڕە مەبن گەورەم... ئەزانم فەرمووتان بەئاغەی ویسویان بدەم، بەڵام ئاخر بەڕێز ویسو تەنیا سی لەسەد قازانجمان دەداتێ، کەچی من کڕیاری وا شك دەبەم بە چل و پێنج لەسەد قازانج لێمان دەکڕێت
— ئاووا... ئەی بۆ پێشتر نەتگوت هەتیوە؟
— دەمویست عەرزتان بکەم گەورەم...
— زۆر باشە... بەڕێز ویسو جارێ ماتڵ بکە و بنێرە بەشوێن کڕیاری چل و پێنج لەسەدیەکەدا.
— فەرمانتان جێبەجێ دەکرێ قوربان.

حسەین ئاغە هاتە دەرەوە و چووە دەفتەرەکەی خۆی و خۆی خەریکی کار کرد. هەروا کەخەریکی نووسینەوەی حسێبەکان بوو لەبەر خۆیەوە دەیگوت... ((کابرای کەران باوك، وائەزانێ من خزمەتکاریم، ئەویش خزمەتکارێکی نەفام... پیاوی پیاوانە کەر و گایشی باش بەخێو ئەکا تا زۆرتر کاری بۆ بکەن... ئەم ئەربابە شێتە هەر کاری لەئێمە دەوێت و هیچیتر... ڕاوەستە... دونیا هەروا نامێنێ... ڕۆژی منیش دێتە بەرەوە، کە هەقی خۆمت لێ بستێنم... هەر ئەمڕۆ و سبەی دەکەی؟

بیست ساڵە ددانم بەخۆمدا گرتووە. ئەڵێم باخۆت ئەقڵت پێ بشکێ و حەقی تەواوم بدەیتێ... بەڵام تۆ هیچ ڕەحم و مرۆڤایەتییەکت لە دڵدا نییە و هەر بۆنی مرۆڤایەتیشت نەکردووە... ئاخر ئەمە کەی ڕەوایە ئێمە زەحمەت بکێشین و تۆ بیخۆی؟... ئێستا ئەڕۆمە لای و هەرچی لەدەمم دەربێت پێی ئەڵێم... خۆی بە بنیادەم ئەزانێ... کابرای بێ شەرەف من بەنەفام ئەزانێ... باشە... ئەگەر حەقی خۆمت لێ نەستێنم، هەر بۆ مردن باشم... بەڵێ... نابێ لەمە زۆرتر نەجابەتم هەبێ... دڵنەرمی و لێبوردن سوودی نییە... نەفامی بێ مێشك، هەر زاری ئەکاتەوە و بەسەر کوڕەکەیدا هەڵدەدات... " کوڕەکەم لەئەمریکایە و خەریکە قۆناغی دکتۆرا تەواودەکات."... تەریق نابێتەوە ئەم قسەیە ئەکات. ئەی ئەگەر پیاوێکی گێلی وەك من شەو و ڕۆژ ڕەنجت بۆ نەدا، تۆ ئەو هەموو پووڵ و پارەیەت لەکوێ بوو کوڕەکەت بنێریتە ئەمریکا بخوێنێ؟ کوڕەکەت، تۆ خۆت نەتناردە ئەمریکا... من ناردوومە. منێ کە نەمتوانی بیهێڵم کوڕەکەم تا پۆلی دوانزەش بخوێنێ. ئەگەر تۆی نامەرد حەقی منت نەخواردبایە ئێستا کوڕەکەی منیش دکتۆر بوو... تۆی مانگا بوویتە بابیس، ئەویش دەس لە خوێندن هەڵبگرێت و کرێکاری بکات.

مشتەکۆڵێکی توندی کێشا بەسەر مێزەکەیدا. دەنگی ئەرباب دیسان لەژوورەکەیەوە هات...

— حسەین ئاغە...

حسەین ئاغە ڕاچڵەکی. وەزعی سەر و ڕووی خاس کرد وبە پەلە بەرەو ژووری ئەرباب کەوتەڕێ، لەدەرگای دا و چووە ژوورەوە...

— ئەمر فەرموون گەورەم.

— حسەین ئاغە... خۆت ئەزانی، بەداخەوە وەزعی ئابووریی کۆمپانیا باش نییە.

— بەڵێ وایە گەورەم...

— بەپێی ساڵی رابردوو داهاتمان کەمتر بووەتەوە.

— وایە

— لەجیاتیی ئەوەی داهاتمان زۆرتر بێت ساڵ بەساڵ کەمتر دەبێتەوە... تۆ دەڵێی چی بکەین باشە؟

— گەورەم! ئەبێ خەرجەکان کەمتر بکەینەوە.

— ڕاستە... دەبێ خەرجییەکان کەم بکەینەوە... بۆ نموونە، کاك نووری دەتوانێ ئەرکەکەی مورتەزایش بەڕێوە بەرێت... مورتەزا دەرکە بابڕوا!

— بەچاوان گەورەم.

— وا بزانم کاك نووری هەر خۆی بتوانێ کاری تایپیستەکەش بکات... کەواتە ئەویشمان پێویست نابێ... بەڵام هێشتا هەرماوە... ئەبێ لەخەرجەکان کەمتریش بکەینەوە.

— گەورەم... لەحەقدەسی ئەوانی تریش کەم بکەنەوە.

— حسەین ئاغە! تۆ نازانی من چەندە خەفەت ئەخۆم...

— خەم مەخۆن قوربان... بۆ دڵتان باش نییە... بڕۆم دەرمانەکەتان بۆ بێنم؟

— نا... بلێ قاوەیەك بێنن!

— بەچاوان گەورەم.

— جارێ مەڕۆ ڕاوەستە... دوو کەسیش لە بەشی ژمێریاری دەر بکە... خۆت دەتوانی کارەکەی ئەوان بکەی؟

— بەڵێ گەورەم خۆم دەیکەم... بەسەر دەیکەم قوربان.

— حەزناکەم بیڵێم... بەڵام... چیم پێدەکرێ... ناچارم... لەحەقدەستی خۆیشت لەسەدا بیست کەم بکەرەوە.

— بەچاوان گەورەم وا دەکەم... بەر لە هەموو شتێك پێویستە بەرژەوەندیی کۆمپانیا بپارێزین.

— زۆر سوپاس حسەین ئاغە... ئێوە بەراستی کرێکارێکی بەوەفان.

— خوا تەمەنی ئێوە درێژ بکات گەورەم، من ئامادەم بۆ خزمەتکاری.

حسەین ئاغە دەگەڕێتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. لەپشتی مێزەکەیەوە دادەنیشێت و خەریکی نووسینەوەی حیساباتی کۆمپانیا دەبێت و لەهەمان حاڵیشدا بۆڵەی لێوە دێ... ((ئەم بێشەرەفە ڕاستەوخۆ سووکایەتیم پێدەکات. لای وایە من لەسەگیش

کەمترم...   حەز ئەکەم پێی بڵێم ئەرێ بێ نامووس تۆ کێی؟ وا دەزانی چونکە دەوڵەمەندی ئیتر ئینسانیت؟ تۆ چ مافێکت هەیە جناو بدەی بەخەڵك؟ خۆ تائێستا پارەت بە خۆڕایی بەکەس نەداوە... بینایی چاو و شیرەی گیانی ئێمە ئەگریت و مانگانە حەقدەسێکی کەمان ئەدەیتێ... ئێمەمانان کە لەم دونیایەدا ئەوەندە کار دەکەین و زەحمەت دەکێشین بۆ ئەوەیە ،کە شەرەفی خۆمان بپارێزین... جا کە تۆ هیچ شەرەف و رێز وکەسایەتییەك بۆ ئێمە قایل نابی، ئیتر ئەم ژیانە چ سوودێکی هەیە؟... نا... من چیتر ناتوانم بۆ پارووە نانێك ئاوا خۆم سووك و بێ نرخ بکەم... هەر ئێستا ئەرۆمە ناو... (دەفتەرەکەی بەر دەستی فرێدەداتە سووچێك) ئەڵێم ناپیاوی کەرانباوك ئەو جناوە بەکێ دەدەی؟ تۆ چ هەقێکت هەیە ئاوا بقیرێنی بەسەرماندا؟ ... دەمم ئەکەمەوە و چاوم ئەقووچێنم... بۆ نەڵێم؟...؟ بیست ساڵە سەرکوت ئەکرێم... ئیتر بەسە... تاقەتم لێ نەماوە تا ئێستا لەبەر ریشی سپیت رێزم بۆ دادەنای ،بەڵام ئێستەودوا گەورە و بچووکی ئەنێمە لاوە... ئەرۆمە ژوورەکەی وا بەسەریدا دەکێشم هەتا مێشکی بپژێت... ئەڵێم تف لەرووت بۆ کردەوەت...

دەنگی ئەرباب لەژووورە شووشەییەکەوە بەرز دەبێتەوە...

— ئۆهۆی.. هەی کەر و گا!

حسەین ئاغە کراسەکەی ساف دەکات و بە هەڵەداوان بەرەو ژوورەکە دەچێ...

— ئەمر فەرموون گەورەم

— ئەرێ نەفام، ئەی تۆ شعوورت نییە؟

— چی بووە گەورەم؟

— وس بە! تەریق بەوە.. دارزێ.. لەدەستی تۆ خەریکە شێت دەبم.

— گەورەم تووڕە مەبن... دەرمانەکەتان بۆ بێنم؟

— برۆ ون بە لەبەرچاوم.

— بەچاوان گەورەم.

— راوەستە!

— بەڵێ گەورەم.

— ئۆتۆمبێلەکەم لێرەیە؟... پالتاوەکەم کوانێ؟

— لێرەیە گەورەم

— بیگرە با لەبەری بکەم...

حسەین ئاغە پاڵتاوەکە دەهێنێت و دەیگرێ تا ئەرباب لەبەری بکات.

— جانتایەکەم بدەیە دەستم!

— بەچاوان گەورەم.

حسەین جانتایەکە دەداتە دەستی.. ئەرباب ئاماژە دەکاتە سەر پاکەتێك، کە لە سووچێکی ژوورەکە دانراوە.

— دوانیوەڕۆ ئەو پاکەتە دەبەیتەوەماڵەوە!

— بەچاوان گەورەم.

ئەرباب دەکەوێتە ڕێ و حسەین ئاغە لەپشتە سەرییەوە لەپلیکانەکان دەچێتە خوارەوە و دەرکی ئۆتۆمبێلەکەی بۆ دەکاتەوە. ئەرباب سواردەبێت و حسەین ئاغە کڕنۆشی بۆ دەبات...

— بەخێرچی گەورەم... خوات لەگەڵ...

# (کارگەی فێرکاری)

گوتیان: ((مامە گیانی... ماشەڵڵا لەقوتابخانە بە یەکەم دەرچووە.))

گوتم: ((بەخ بەخ... ئافەرم... بارەکەڵڵا))

وەکوو منداڵێکی وشیار و زیرەك بەرچاو نەدەکەوت، بەڵام دەیانگوت: ((نەك هەر ئەمساڵ بەڵکوو تا پۆلی سێهەمی ناوەندیش هەموو ساڵێك، پلەی لە خوێندنگەدا هەرلە سەرەوە بووە...)) گوتیان ((مامە گیانی، شتێکی لێ بپرسە...)) نازانم ڕادەی زانینی کوڕەکەیان تاقی دەکردەوە یا هی من؟ ... جا بزانە لەم دنیایەدا چ بنیادەمگەلێکی سەیر و سەمەرە دەژین!... دەترسام نەتوانم پرسیاری ڕاست و دروستی لێ بکەم و منداڵەکە تەریقم بکاتەوە... یان خۆی هەر نەتوانێ وڵامی پرسیارەکان بداتەوە... گوتم ((ماشەڵڵا زۆر زیرەکە. وڵامی هەموو پرسیارەکانی لە بەرە... بەڵام دایك و باب و کەسوکاری دەسبەردار نەبوون و هەر دەیانویست زۆرتری تاقی بکەمەوە. گوتیان: ((لێی بپرسە! پرسیاری قورسی لێبکە!)) خوایە چۆن گیرم کردووە... چیی لێبپرسم؟ لەوە دەترسام ئەگەر پرسیاری سەختی لێ بکەم نەتوانێ وڵام بداتەوە و ئەوانیش تووڕە بن. لەدڵی خۆما وتم: ((باشتر وایە پرسیارێکی سادەی لێ بکەم.)) پرسیم:

— شەڕی مەلا زکریت (یەکێکە لەشارەکانی تورکیا) لەناوان کێ و کێدا ڕووی دا؟

کوڕەکە هەروەکوو ئەو قوتابیانەی وانەکەیان لەبەر نییە و دەیانەوێ خۆیان بخافڵێنن تا قوتابییەکی تر وڵامەکەیان بۆ بدۆزێتەوە، تۆزێ مینگەمینگی کرد و گوتی:

— فەرمووتان مەلا زکریت؟...

تێگەیشتم وڵامەکەی نازانێ. بۆ ئەوەی کارەکە خراپ نەکات گوتم:

- ڕاوەستە با پرسیارێکی ترت لێ بکەم.

بەڵام کوڕەکە بێ ئەوەی گوێ بداتە قسەکەی من گوتی:

- گەورەم! ئەمساڵ مامۆستای مێژوومان نەهاتە سەرکار.

- ئەی مامۆستایەکی تر نەهاتە جێی؟
- ناء...

دایکی گوتی:

- مامە گیانی، وانەکانی تری لێ بپرسەوە.

منالەکە سوور هەلگەڕا. منیش ئارەقەم کردبوو. پرسیم:

- شەڕی (چناق قەلا) لەکوێ ڕووی دا؟
- قوربان ئەوە ئەبێ زۆر کۆن بێت. ئێمە بەس مێژووی شەڕە هاوچەرخەکان دەخوێنین.
- بابەگیان مەسەلەی فیساگۆرس چییە؟
- ئێمە هەندەسەمان نەخوێندووە.
- بۆچی؟
- مامۆستاکەی ئێمەیان نارد بۆجێگەیەکی دی.
- ئەی کەسی تر نەهاتە جێی؟
- بەلێ... یەکێ هات، بەلام مامۆستا نەبوو... خوێندنی دەرمان سازیی تەواوکردبوو، بەلام هیچ شارەزاییەکی لەهەندەسەدا نەبوو

ئەمجارەیان باوکی گوتی:

- مامە گیانی، پرسیاری لە وانەکانی تر لێ بپرسە.

منیش حەزم دەکرد شتێك بپرسم مندالەکە ولامی بداتەوە و ڕزگاری بێت... پرسیم:

- گەورەترین ولاتی ئەورووپا کامەیە؟
- لەجوگرافیا دەپرسنەوە؟
- بەلێ.
- ئێمە لەجوگرافیا تەنیا دوو سێ بەشمان خوێندووە... مامۆستاکەمان ئافرەتێك بوو، چونکە دووانەیەکی ببوو، نەیدەتوانی بێتە قوتابخانە.

پووری گوتی:

- مامە گیانی، پرسیاری ئەدەبیاتی لێ بپرسە.

پرسیم:

- ڕۆلەگیان تەوفیق فیکرەت کێیە؟
- فیکرەتی گەورە یا بچووکەکەیان؟

- فیکرەت یەك کەسە، گەورە و بچووکی نییە.
- با، دوانن... فیکرەتی گەورە لەگەڵ دەستەی فتبۆڵی فەنەرباخچە یاری دەکات.
- ڕۆڵە گیان من تەوفیق فیکرەتی شاعیر دەڵێم.
- ئێمە خۆ ئەدەبیاتمان نەخوێندووە... مامۆستای ئەدەبیاتمان ئافرەتێکی پیر بوو لەنیوەی ساڵدا مرد.
- ئەی کاتی وانەی ئەدەبی چیتان دەکرد؟
- شانۆمان دەگێڕا...

بارودۆخی هەموو قوتابییەکان ئاوایە... دایك و باوك بەهەزاران ڕەنج و مەینەت خەرجی خوێندنی منداڵەکانیان دابین دەکەن و هیوادارن منداڵەکانیان لەخوێندنگادا باش بخوێنن و هەمووشیان زیرەك بن. ئیتر نازانن خوێندنگەکان مامۆستایان نییە و منداڵەکان هیچ ناخوێنن. ساڵی خوێندن کۆتایی دێت... مامۆستاکان دەڵێن خەتای قوتابییەکان بووە و قوتابییەکانییش تاوانەکە دەخەنە ئەستۆی مامۆستاکان... هەرکاتێکیش وەزیری پەروەردە دەگۆڕدرێت، یاسایەکی نوێ بۆ خوێندنگەکان دادەنرێت کە تاقیکردنەوەکان ئاسانتر بکرێنەوە و خوێندکارەکان بنێردرێنە پلەیەکی سەرووترەوە. لەبەر ئەوەش کە ساڵی ڕابردوو پرسیارەکانی تاقیکاری لە ئیدارەی پۆستەو گەیاندندا دزران، ئەمساڵ بۆ بەرگری لە دووبارە بوونەوەی ئەو دزییە، لەلایەن وەزارەتی پەروەردە و فێرکردنەوە، فەرمان درا بەڕێوەبەری قوتابخانەکان هەرخۆیان پرسیاری تاقیکاری دابنێن!؟ جا کەوابوو، بەسەرنجدان بەوەی، هەرکەسێك هەر ئەوەندە خوێندەواری هەبێ تا بتوانێ شتێ بنوسێت یا بخوێنێتەوە، باشتر وایە لەساڵەکانی داهاتوودا خوێندکار پرسیارەکان هەڵبژێرێت و مامۆستا وڵام بداتەوە و تاقی بکرێتەوە...؟! بەم کارە، هەموو شتێك باش دەبێت... گیروگرفتی خوێندکارەکان چارەسەر ئەکرێت... ئەرکی دەوڵەتی خزمەتگوزاریش، ئەوەیە کە لە پاڵی هەموو پلان و پرۆژەکانی کارخانەسازیدا، کارگەیەکی سەرەکیش بۆ فێرکردن دامەزرێنێ؟!.

# ئەسەدی دادگەر

هەرکام لەدۆست و ئاشنا و خۆشەویستەکانی ئێمە، رۆژێك دەمرن، ئێمە خۆیشمان رۆژێك دەمرین.. مردن ئەنجامی هەموو ژیانێکە، بەلاَم ئەمەیان لەگەڵ ئەوانی تر جیاواز بوو. ئەوانەی دەیانناسی، بە بیستنی هەواڵی مەرگی، نیوە گیان بوون. تائەو کاتە تەنانەت لەفکریشمدا، مردنم ئەوەندە بێ بەزەیی نەدەزانی. حالّم زۆر خراپە، وەك باڵدارێکم هەوایان لێ گرتبێتەوە و باڵیان قرتاندبێت یا وەك ماسییەك کەلە دەریا برابێت. بەڵێ... ئەسەدی دادگەر لەناوماندا وا دەژیا و ئاواش مرد. هەوڵی دەدا هەم هەوا و هەمیش دەریا بۆخۆی دابین بکات. بەدرێژایی پەنجاوچوارساڵ تەمەنی، زۆری ئاڵوگۆڕ بینی و زۆر گیروگرفتی چارەسەرکرد و هەرکۆڵی نەدا... تەمەنی کورت و پڕبار بوو... ئەگەر بەم بەربەرەکانێیە بڵێین ژیان... ئێمە ئەمڕۆ پیاوێکی دڵسۆز و ماندوومان لەگەڵ ناشت. پیاوێکی پەنجاوچوار ساڵە کە لە جێگایەکی بێ هەوادا ئەژیا و لەشوێنێکی بێ ئاودا مەلەی دەکرد... ئاشکرایە چەندە هەوڵ و تەقەلای داوە و چەندەش شەکەت و ماندوو بووە.

ئەگەر ئێمە شتێك بەناوی دەرد و ڕەنج دەناسین و ئەگەر یەکێکیشمان تێدا هەڵکەوێ بتوانێ یا بڵێت کە دەتوانێ تەحەمولی تاقە دەردێك بکات، ئەوا ئەسەدی دادگەر بەکردەوە، سەلماندی کە هەڵگری هەموو دەردەکانە.

لە دۆست... لە بنەماڵە... لە ژیان... لە نەبوونی... لە ئاستی هەر هەموویاندا کارا بوو، بێ ئەوەی هاواریشی لێ بەرز ببێتەوە.

هەرکەس بتوانێ ئەم هەموو دەردە هەڵگرێت و لەگۆ نەکەوێت، من پێی دەڵێم پیاوی راستەقینە... ئەسەدی دادگەر، چونکە ولاَت و هاوولاَتییەکانی خۆشدەویستن، دەیتوانی تەحەمولی ئەو هەموو دەردە بکات. بەئاسانی دەیتوانی بگاتە ئەو پلەو پایەیەی ،کە

خەڵکانی تر بەخەونیش نایبینن. کەچی هەرلەژێر باری نەبوونیدا ژیا و پشتیشی نەچەمایەوە. ملی بۆ کەس کەچ نەکرد. پەنجاو چوارساڵ بەسەربەرزی و پیاوەتی ژیا و بەرێگایەکدا ڕۆیشت کە دەیناسی و بە ڕاست و دروستی دەزانی. هیچی لەهیچ کەس وەرنەدەگرت، بەڵام هەرچیی هەبوو بەهەمووانی بەخشی. ئەسەدی دادگەر دەیگوت: (( من ناڵێم چەوت تێگەیشتووین... بەڵکوو ئەڵێم دوژمن ئاوای دەویست و ئێمەی چەوت و پێچەوانە تێگەیاند... فێڵ و تەڵەکەی چەپەڵ و بێ بایەخی دەسەڵاتدارانی ترسنۆك و چاوچنۆکی ئێمە، بێجگە لەدرۆ و دەلەسە، هیچی تری تێدا نەبوو بۆ ئەم میللەتە.))

هەر ئەوانیش ئەم پیاوە ئازا و لێهاتووەیان لەناو برد. چونکە دژی پیلانە چەپەڵەکانیان بوو. ئەسەدی دادگەر لە هەموو شەووڕۆژێکدا پانزە تا هەژدە کاتژمێر کاری دەکرد. کشتوکاڵی دەکرد و بە دەسڕەنجی خۆی دەژیا. من چاکم دەناسی... ئاگادار بووم کە هەموو ئەو کارانەی بۆ گەل و نەتەوەکەی دەکرد. ڕێبەرانی حیزبەکان چ ئەوانەی سەر بە حکوومەت بوون و چ ئەوانەی دژی حکوومەت، هێندەی لێدەترسان، هەرچیی بویستایە بەگوێیان دەکرد. بەداخەوە ئەسەدی دادگەر بەم دواییانە بیر و زەینی کوێر ببوو، زۆر شتی لەبیر دەچووەوە. دواین جاریش کە زەینی بەرایی نەدا، هەر ئەوە بوو کە بەڵێنێکی گەورەی بەدۆستانی دابوو، کەچی لەبیری چوو و هەربە تەنیایی چووە ژێر گڵ. ئەسەدی دادگەر پیاوێکی وڵاتپارێز و مرۆڤدۆست بوو. بۆ بەختیاری بەرەو دوارۆژ، زۆر تێکۆشا و بەهۆی هەوڵ و تێکۆشانی ئەوەوەیە کە ئێمە ئێستا هەر ڕۆژە، لەرۆژی پێشتر کامەرانتر دەژین و لەداهاتوویشدا دەگەینە لووتکەی بەختیاری.

# شارەزا

## (بێگانەکان لە ئێمە شارەزاترن)

من لەئەستەمبوڵ هاتوومەتە دونیا و هەرلەوێش گەورە بووم. لەڕووی شەجەرەنامەکانمانەوە دەردەکەوێت کە حەوت پشتم لەئەستەمبوڵ هاتوونەتە دونیا و لەوێ ژیاون و هەر لەوێش نێژراون. کاتێ لەئەستەمبوڵ دەچمە دەرەوە، واهەست دەکەم ئەتاسێم. تا ئێستا چەندجار سەفەری ئەورووپام کردووە... ماوەیەك لەئەمریکا بووم... چەندین مانگ لەگەڵ وەڤدێکی ئابووری و رامیاری لەپاریس.. سەردانی ((ڤەندیك)) و ((پراك))م کردووە، بەڵام هیچ کامیان بەڕای خۆم ناگەنە ئاستی جوانی و ئاسایش و دڵگیریی ئەستەمبووڵ.

ئێوە هەرچی دەڵێن سەربەستن... ((پێم بڵێن شێت، نەزان، چاوچنۆك یا هەرچی کە دڵ و حەزتان دەخوازێ...)) بەڵام من تەنیا ئەوینداری ئەستەمبوولم و لەو شارە جوان و خۆشەویستە نەبێت، لەهیچ شوێنێکیتری ئەم جیهانەدا ناتوانم بژیم. هەر ئەم هۆگرییەشم بۆ ئەستەمبوڵ بووە کە هەرچی پلە و پایەی بەرزتریان پێداوم، نەمویستوون و وەك ئەرکۆمەندێکی ئاسایی لەئەستەمبووڵدا ماومەتەوە. پێنج ساڵی دی خانەنشین دەبم و ئیتر تا دوایین کاتەکانی ژیانم لەئەستەمبوڵ جیا نابمەوە.

خێزانیشم هەروەك خۆم حەوت پشتی ئەستەمبوڵییە و ئەگەر وایش نەبوایە، وەکوو هاوسەری ژیانم هەڵم نەدەبژارد. من مافی خۆمە شانازی بکەم بەوەی کە پەروەردەی ئەستەمبوڵم، چونکە لە ئاوا شارێکی گەورەدا هەموو خەڵکێك، غەریب و بێگانە... هەموویان لەشار و ناوچەکانی دیکەوە هاتوونەتە ئێرە... هەرچەند

هەرهەموویان خۆیان بەئەستەمبوولی راستەقینە دەزانن، بەلام لەقسەکردنیاندا دەردەکەوێ کە پەروەردەی ئەم شارەنین و شێوەی ئاخافتنیان جیاوازە.

چەند مانگێك لەمەوبەر برادەرێکم کەدانیشتووی ئەنکەرەیە و گەنجێکی چاکیشە، نامەیەکی بۆ ناردبووم و ژن و پیاوێکی ئەمریکیی پێ ناساندبووم کە ویستبوویان گەشتێکی ئەستەمبوولْ بکەن و پێی راسپاردبووم لە رادەی توانای خۆمدا یاریدەیان بدەم و شارەکەیان پێ بناسێنم. جا، کاتێ بەئاوا کارێکی سادە و بچووك دەکرێ دڵی دۆستێك شاد و رازی بکرێت، بۆچی مرۆڤ ئەو راسپاردە دۆستانەیە بەجێ نەهێنێ؟ بە تایبەتی من کە پەروەردەی ئەستەمبوولْم و هەموو کون و قوژبنێکی شارەزام و کارەکەشم زۆر پێ خۆشە. بە ئاسانی بۆ ماوەی پانزە رۆژ ئیجازەم وەرگرت و ئیتر لە لایەن کار و فەرمانگەکەمەوە خەیالْم ئاسوودە بوو.

وەك هاورێکەم نوسیبووی، ئەبوایە من بۆ دابینکردنی جێگەی خەو و حەسانەوە و کرینی شتومەکی پێویست و پیشان دانی شار و سەیرانگا و شوێنەوارە دلگیرەکانی ئەستەمبوولْ، یارمەتیدەر و رێنمایی میوانەکان بم. منیش بەخاتری ئەو دۆستە بەرێزە دێرینەیەم، ئەرکەکەم گرتەئەستۆی خۆم و خۆم بۆ جێبەجێکردنی کارەکە ئامادەکرد. ئەو رۆژەی کە بریار بوو میوانەکان بەفرۆکە بگەنە ناو شار، لەگەلْ خێزانمدا رۆیشتینە فرۆکەخانە بۆ پێشوازیکردنیان. بەجوانی پێشوازیمان لێ کردن و گەیاندنمانە ئەو میوانخانەیەی پێشتر بەکرێمان گرتبوو. پاش سێ کاتژمێر حەسانەوە، داوەتی مالی خۆمانم کردن بۆ خواردنی نانی ئێوارە. میوانەکان چێشت و خواردەمەنییە تورکییەکەیان زۆر پێ خۆش بوو. خاتوونی ئەمریکی سەرەرای پیاهەلدان بە سەلیقەی کابانیی خێزانم، پرسی؟

- ئێوە چێشتی تایبەتی ((**مەلاغش کورد**)) چۆن لێ دەنێن؟

سەرم هێندە سوور مابوو، ئەوەندەی نەمابوو شاخ دەربێنم، ئەم ژنە ئەمریکییە چۆن ناوی ئەم چێشتە تایبەتەی تورکیا دەزانێت؟ لەحالێکدا زۆربەی هاوولاتیانی خۆمان نەك هەر نەیاندیوە و نەیانخواردووە، بەلْکوو هەرناویشیان نەبیستووە. دۆستەکەم بۆی نووسیبووم کە ئەوان بۆ یەکەمجارە سەردانی ئەستەمبوولْ دەکەن، بەلام هەرکە ناوی ئەو چێشتەم لێیان بیست، بروام نەکرد. بۆیە لێم پرسی:

- ئێوە پێشتر چەندجار هاتوونەتە ئەستەمبوولْ؟

- قەت نەهاتووین، بۆ یەکەمجارە سەردانی وڵاتی ئێوە دەکەین.

- ئەی کەواتە چۆن چێشتی ((مەلاغش کورد)) دەناسن؟ ئایا تا ئێستا لێتان خواردووە؟

- نا... بەڵام پێش ئەوەی بەرێکەوین، کتێبی زۆرم لەبارەی وڵاتی ئێوەوە خوێندووەتەوە، بۆیەش چێشتەکانی ئێوە دەناسم و هەموو تایبەتمەندییەکانی ئێوەش شارەزام و ئاگاداریانم.

ژنە ئەمریکییەکە شێوەی لێنانی چێشتی ((مەلاغش کورد))ی گوت و منیش بەزمانی تورکی نووسیمەوە بۆ خێزانم. ئەو زۆرتر لەمن سەری سوورِما بوو. خاتوونی ئەمریکی دیسانەوە پرسیی:

- ئێوە ((**یاخنی پاپاس**)) (ئاو گۆشتی کەشیش) چۆن لێ دەنێن؟

- ئێوە خۆتان بیلێن، ئێوە، کە لە ئێمە زۆر شارەزاترن.

- ئێوە سەرەتا پیازەکە سوورەوە دەکەن یان هەر بەسوورەوە نەکراوی دەیخەنە ناو مەنجەڵەکەوە؟

خێزانم شەرمەزارانە و بەترسەوە وەڵامی دایەوە:

- من تائێستا ((یاخنی پاپاس))م لێ نەناوە.

کابرای ئەمریکی هەڵیدایە و گوتی:

- بەپێی ناوی چێشتەکانتان دەردەکەوێ کە ئێوەخاوەنی ئیمپراتۆرییەکی مەزن بوون، بۆ وێنە چێشتی ((**ئارنادەت جگەری**)) واتە جەرگی ئالبانی، یا چێشتی ((**چەرکس تاوقوو**)) یانی مریشکی چەرکس، یا ((**بوچای کوردی**)) واتە کولێرە چەورەی کوردی، یاخود ((**تاتار بورگی**)) یانی کولێرە چەورەی تاتار و ....

ئەوەی ڕاستی بێت من سەرەڕای ئەو هەموو ئەستەمبووڵی بوونەشم، ناوی یەك دوانێکیشم لەو چێشت و خواردنانە نەبیستبوو و ناوی سێ چوارێکیشیانم بەهەڵە دەگوتەوە.

بۆ ئەوەی نەزانییەکەی خۆمان لە میوانەکان بشارمەوە ، خۆم هەڵقورتاندە ناو قسەکانیان و باسەکەم گۆڕی و لەبارەی سەیرانەکەیانەوە لێم پرسین. ژنە وتی:

- من زۆرم پێ خۆشە بڕۆینە قاوەخانەیەك و قلیان (نێرگەلە) بکێشین.

بەسەرسوورِمانەوە گوتم:

- جا ئەمڕۆ قلیان لەکوێ دەسدەکەوێت؟... پێشتر ئاوا شتێك هەبوو، بەڵام لەمێژە هەڵگیراوەو ئیدی باوی نەماوە.

مێردەکەی گوتی:

- لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا چەند قاوەخانەیەکی خۆماڵیتان هەن... ئەگەر کتێبی ڕێنماییەکەم پێ بوایە ناونیشانەکانیانم پێدەگوتن.

ژنەکەی گوتی:

- شەوێك بچینە ناو ((**داردانێل**)) و ماسیی ((**لوفر**)) بخۆین.

- ئەوی ڕاستی بێت من هێشتا نەڕۆیشتوومەتە ئەوێ و نازانم ماسیی ((لوفر)) چییە.

هاوسەرەکەی بەسەرسووڕمانەوە گوتی:

- ئەی مەگەر ئێوە خەڵکی ئەستەمبووڵ نین؟... ماسیی ((لوفر))ی ئەستەمبووڵی لەجیهاندا بەناوبانگە... ئێمە لەناو کتێبەکاندا خوێندوومانە... تەنانەت وێنەکانیشمان دیون... لەم وەرزەدا، ئاوەکانی ((داردانێل)) پڕ دەبن لەماسیی ((لوفر))

لەدڵی خۆمدا گوتم : ((خوا دەستی نووسەری ئەو کتێبانە بشکێنێ... ڕەحمەت لەباوکی ئەم رژێمەی ئێمە کە هەلومەرجی خوێندنی لە وڵاتدا قورس کردۆتەوە تا لاوەکان نەگەنە پلە و پایەی بەرزی خوێندن...)) بەراستی هۆی شەرمەزارییە، کابرای ئەمریکی لەوپەڕی دونیاوە هاتووە و خەریکە ناونیشانی وڵاتەکەی خۆمانمان پێدەڵێتەوە.

پاش شیوکردن، خێزانم قاوەی ساردی ئەمریکیی بۆ هێنان. ژنە ئەمریکییەکە پرسی:

- ئەی ئێوە قاوەی تورك ناخۆن؟

- لەو کاتەوە وەجاخی قاوە کوڵێنی ئەمریکیمان کڕیوە ئیتر قاوەی تورکمان نەخواردووە.

پیاوە ئەمریکییەکە بێ ئەوەی هیچ بڵێت تەنیا بزەیەکی هاتێ، کەلە هەزار گاڵتە و سووکایەتی و جناودانیش تاڵتر بوو.

نزیكەی نیوەشەو بوو كە میوانەكانمان بردنەوە  بۆ هوتێلەكەیان و خۆمان بەرەو ماڵ گەڕاینەوە. زۆر پەژیوان بووم لەو كارەی كردبووم. هەستم بەبچووكی و سووكایەتی دەكرد. زۆرم حەز دەكرد هەلێك بڕەخسێت و لەو هاوڕێیەتییە ڕزگار ببم... زۆر بەداخەوە ئەو هەلە هەر نەڕەخسا. بەیانی، بەوپەڕی ناڕەزامەندییەوە ڕۆیشتم بۆ هوتێل. كابرای ئەمریكی گوتی:

- ئەم هوتێلە وەزعی باش نییە و لەهەمان كاتدا نرخەكەشی گرانە... واباشە بچینە جێگەیەكی تر.

لە گیرفانیدا نەخشەی شاری دەرهێنا و دەستی كردە خوێندنەوەی ناوی هوتێلەكان. من ناوی هیچ كامیانم هەر نەبیستبوو. كابرا گوتی:

تۆ تەكسییەك بگرە تا من بتانبەمە ئەو هوتێلانە.

- چەند وێستگە لەولاترەوە وێستگەی تایبەتی تاكسی هەیە.

- من وای بۆ ناچم.

- چی وای بۆ ناچی؟

- لەو شوێنەی كە ئێوە دەیلێن وێستگەی تاكسی نییە.

لەدڵی خۆمدا گوتم: ((سەیری ئەم كابرا بێگانەیە بكە، دەیەوێت من فێربكات!!...

ڕۆیشتینە وێستگە... دیتم تاكسییەكان بەپەلە بە بەردەماندا تێدەپەڕن، بە بێ ئەوەی هیچ كامیان بوەستن. هەرچی دەستم بۆ ڕادەگرتن سوودی نەبوو. تەكسییەك وەستا و شۆفێرەكەی گوتی:

- ئەی كوێری، نابینی لێرە پۆلیس وەستاوە و ئەگەر بوەستین غەرامەمان دەكات؟

- بۆچی ئێرە وێستگەی تەكسی نییە؟

كابرای ئەمریكی كە دیتی من زویر بووم، گوتی:

- لەناو ئەو كتێبە ڕێنماییەی كەئێمە هەمانە، نووسراوە وێستگەكانی تاكسی لەئەستەمبوولدا لە چەند شوێنێكدا دائەنرێن. كەوێستگەیەكیش گوازرایەوە بۆ شوێنێكی تر، لەجێگە پێشووەكەیدا، تابلۆی ((ڕاوەستان قەدەغەیە)) هەڵدەواسن و

ئەگەر تاکسییەك راوەستێ، ئەوا پۆلیس سزای دەدات. ئەمەش بۆ ئەوەیە کە لەو ڕێگەیەوە داهاتی حکومەت زیاتر بکرێ.

لەشەرمان، ئارەقە بەناو چەوانمدا دەڕژایە خوار... کابرایەکی ئەمریکایی لەهەموو ڕاز و ڕەمزەکانی حکوومەت و پۆلیس و ئەو هەموو فرۆفێڵەی کە پۆلیس لەگەڵ خەڵکی وڵاتەکەی مندا دەیکات، ئاگادارە... بەدەنگی بەرز گوتم:

- دەك خوایە، نووسەری ئەو کتێبانە زەلیل بن.

ئەمریکاییەکە پرسیی:

- بۆچی نووسەرەکان زەلیل بن؟
- وەی... ئێوە تورکییش دەزانن؟
- زۆر نا... بەڵام لەناو کتێبەکەدا نوسراوە، تورکەکان کاتێ تووڕە بن، وا دەڵێن... ئەرێ ئاودەستی گشتی لەکوێیە؟
- ئێمە لەم وڵاتەماندا ئاودەستی گشتیمان نییە... ئەبێ بگەڕێینەوە هوتێل.

پیاوە ئەمریکییەکە، کەزۆر تەنگاو ببوو و بەهەردوو دەستی پێشی خۆی گرتبوو، بە شێوەیەکی نارەزامەندانە و تا ڕادەیەك تووڕە گوتی:

- با... هەیە.

پاشان ڕووی کردە ژنەکەی و گوتی:

- کتێبی ڕێبەر دەربێنە و بزانە ئاودەستی گشتی لەکوێیە؟

ژنەکەی گورج لەڕووی نەخشەکەوە جێگەی تایبەتی ئاودەستی دۆزییەوە، پشتی کردە پەیکەرێك کە لە ناوەڕاستی مەیدانەکەدا بوو و گوتی:

- لەناو کۆڵانی لای چەپدا ئاودەستی گشتی هەیە.

لەدڵی خۆمدا گوتم: ((چەندە خۆشە قسەکەی درۆ بێت و ئەم پیاوە ئەمریکییە خۆی تەڕ بکات.)) کەچی ژنە ئەمریکییەکە وەك ئەوەی بەدەستی خۆی ئاودەستەکەی دروستکردبێ، یەکسەر ئێمەی بردە ناو کۆڵانەکە و پیشانیداین.

کە کابرا لێ بووەوە، سواری ئوتۆمبێل بووین و بەرەو لای ئەو هوتێلە کەوتینە ڕێ کە خۆی ناونیشانەکەی دابوو. خاتوونی ئەمریکی پەیتاپەیتا سەری لەشووشەی تەکسییەکە دەردێنا و دوایی سەیرێکی کتێبەکەی دەکرد و ناوی هەموو شوێنەکانی دەگوت:

- ئێرە (**بەشیکتاش**)ە... ئێرە (**بێشکە**)یە... (بێشکە ناوی شەقامێکی بەناوبانگە)

کابرا گوتی:

- ئەرێ ئەستەمبووڵ بەردی زۆرە؟

بەسەرسوورمانەوە وڵامم دایەوە:

- نا... مەبەستت چییە؟

- چونکە ناوی زۆربەی شەقامەکانی ئێوە، بەردیان پێوەیە... وەك ((بەشیکتاش)) و ((**قیرتاش**))، ((چەمبری تاش)) ، ((**ئەتلاماتاش**)) ، ((**کەجاتاش**)) ، ((تاش قەساب)) ، ((تاش **کیزاك**)) ، ((**ویکلیلی** تاش)) ، ((**گابا** تاش)) و... و....

کەمێك ئاسوودە بووم و گوتم:

- بەڵێ بەرد زۆرە... ((**یورس** تاش))یشمان هەیە.

ژنەکەی پرسیی:

- ئەی شوێنی ((**یورشاتاش**)) لەکوێیە؟

- نازانم.

مێردەکەی بەدڵنیاییەوە سەرێکی لەقاند و گوتی:

- هیچ کەس ئەو شوێنە نازانێت... ((یورشاتاش)) بەردێکی زۆر کۆن و لەمێژینەیە و ئێستاش شوێنەکەی دیار نەماوە.

گەیشتینە ئەو هوتێلەی کە کابرای ئەمریکی ناونیشانی دابوو. منیش تا ئەو کاتە نە ناوم بیستبوو و نە شوێنەکەیشیم پێدەزانی. بەڕاستی هوتێلێکی خاوێن و هەرزانیش بوو. ژوورێکم بۆگرتن... جانتاکانیان لەوێ دانان و خۆمان بۆ گەڕان هاتینە دەرەوە. من دەمویست بۆ نیوەڕۆ بیانبەمە کەبابخانەیەکی پاك و خاوێن و جوان. کەگەیشتینە ((**سەرکجی**)) ژنەکە وەك بەجوانی ئەوێ بناسێ، گوتی:

- لێرە دووکانێکی خاوێن هەیە و ماسیی باشیشیی بۆخواردن تێدایە.

من، کە تا ئەوکاتە هەر ناوی ئەو دووکانەشم نەبیستبوو، پرسیم:

- ئەوەش لەناو کتێبەکەتاندا نووسراوە؟

- نا... برادەرێکم کە پێشتر لێرەبوو، ئەم ناونیشانەی دامێ... لەناو دەفتەرەکەماندا نووسیومانە.

لەپشتی ((**پالیك** بازاری))یەوە (واتە بازاری ماسی فرۆشەکان) چووینە ناو دووکانێکی بچکۆلە. پیاوێك لەپشتی مەقەڵییەکەوە دانیشتبوو. پێمگوت:

- ئەمانە بێگانە و غەریبن باشترین ماسییان بدەرێ...

هێشتا دوایین وشە لەزارم نەهاتبووە دەر ،کە ژنە ئەمریکییەکە گوتی:

- (**پالاموت**)مان بەرێ (پالاموت ناوی چەشنە ماسییەکە)

کابراش پالاموتی بۆهێناین کە تازە سووركرابوونەوە. ئای چەندە خۆش و بەتام بوو... تائێستا ماسیی ئاوا بەلەززەتم نەخواردبوو. پاش نان خواردن و هاتنەدەر لەدووکانەکە، خاتوونی ئەمریکی گوتی:

- ئێستاش بڕۆینە قاوەخانەیەك و قلیانێك بکێشین.

من نەمدەزانی قلیان لەچ شوێنێکی ئەستەمبوولْ هەیە... لەژیانمدا قلیانم نەکێشابوو... گێژ و وڕ و دوودڵ بووم. کابرای ئەمریکی کتێبەکەی دەرهێنا و سەیرێکی کرد... منیان بردە قاوەخانەیەك کە بە قسەی خۆیان قلیانی هەبوو. پێشنیاری سێ قلیانماندا... منیش بەبۆنەی ئەوانەوە ناچاربووم سەرەو قلیان بکێشم... جا، لەبەرئەوەی نەمدەزانی چۆنی بەکار بێنم، سەیری ژن و پیاوە ئەمریکییەکەم دەکرد... ئەوان هەچ کارێکیان بکردایە منیش دەمکرد.

ژن و مێردەکە، قلیانەکەیان هێنایە قوولْەقوولْ، منیش ویستم، وابکەم بەلاْم کە فووم لێکرد هەموو ئاگر و خۆلْەمێشەکەی بەملاو لادا هەلْپڕا.

ژنەکە ئەوەندە پێکەنی وەختەبوو لەسەرخۆی بچێت... بەدەم قاقای پێکەنینەوە پرسیی:

- ئێوە نازانن قلیان بکێشن؟... نابێ فووی لێبکەن... ئەبێ هەلْیمژن و دوایی دووکەلْەکەی بدەنە دەرەوە.

وامکرد، بەلاْم زۆر توند کەوتمە کۆکین. کە لە قاوەخانەکە هاتینە دەرەوە، کابرای ئەمریکی گوتی:

- ئێستە با بڕۆینە ((چوارسووی گەورە)) (بازاڕی گەورە)

لەدڵێ خۆمدا گوتم: ((سەدهەزار کەڕەت شکور...)) بازاڕی گەورەم وەك ناولەپی دەستی خۆم دەناسی و دەمتوانی شارەزاییەکەی خۆم لەو بارەیەوە پیشانی میوانەکان بدەم. کەوتمە پێشیانەوە. لەسەرخۆ و بەدڵنیایی هەنگاوم داویشت و ناوی بازاڕەکانم پێدەگوتن (( ئێرە بازاڕی گەورەیە و...))

ژنەکە پرسیی:

- شوێنی سەرپۆش فرۆشەکان لەکوێن؟ کۆنەفرۆش لەکوێن؟ عەنتیکە فرۆش لەکوێن؟ بازاڕی کۆنەفرۆشەکان لەکوێن؟

ژنەکە دیتی من گێژ بووم، گوتی:

- ئەی باشە... لێرە لەسەر پێستی وشترەوە وێنەگەلێك دەکێشن... ئەوان لەکوێن؟ بڕۆین چەند وێنە بکڕین.

- نازانم... تا ئێستە نەڕۆیشتووم.

کابرای ئەمریکی دووتوێی کتێبەکەی کردەوە... گورج ناونیشانی دووکانەکانی دۆزییەوە و ئیتر چووینە ئەوێ و ئەوان چەند وێنەیەکیان کڕی. من، کە وامدەزانی هەموو ناو بازاڕ دەناسم و جوان لێی شارەزام، لەئاستی میوانەکاندا شەرمەزار بووم! کابرای ئەمریکی مێژووی بازاڕی بۆ باس کردم و پێیگوتم لەکەیەوە دروست کراوە و کێ بناغەی داناوە... کەرانباوك وەك ئەوەی خۆی بناغەی ئەو بازاڕەی داڕشتبێ، وابوو! شارەزای هەموو سووچ و قوژبنێکی بوو... تەنانەت دەیشیزانی چەندجار دەستی لێدراوە و نۆژەن کراوەتەوە!

ئیتر من بێدەنگ بووم و لەراستیدا ئەوە ژن و پیاوە ئەمریکییەکە بوون، ببوونە شارەزای رێگا و چاوساغ و رێبەری من... منیان بردە بازاڕی ئەمانەت فرۆشەکان... بازاڕی کاغەز و کتێب... کابرای ئەمریکی گوتی:

- با بڕۆینە بازاڕی مسگەرەکان...

رۆیشتین... من تائێستا ئەو بازاڕەم نەدیبوو... گرم و هۆڕ، پیاوی کاس دەکرد! ژن و مێردە ئەمریکییەکە هەندێ کەلوپەلی مسیشیان کڕی. ژنەکە گوتی:

- لە ((تەختەقەڵا))دا کاروانسەرایەکی کۆن هەیە، بابڕۆین سەیرێکی ئەویش بکەین.

لەوڵامدا گوتم:

- ناویم بیستووه، بەڵام نازانم لەکوێیە!

ئەوان منیان بردە ((تەختەقەڵا)) و لەڕووی کتێبەکەیانەوە، هەموو دیاردەکانی ئەو کاروانسەرا مێژینەیەیان پێ ناساندم. لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژە زۆر ماندوو ببووین، ئەوانم زووتر بردەوە بۆ هوتێلەکەیان... بۆ بەیانیی ڕۆژی دوایی، هەرکە هاتینەدەر، کابرای ئەمریکی گوتی: بابڕۆین حەمامەکانی ئەستەمبووڵ ببینین... لەدڵی خۆمدا گوتم: ((جاوەرە ئا ئەمەیان چارە بکە! ئاخر کابرا لەئەمریکاوە کەوتووەتە ڕێ بۆ ئێرە بۆسەیری حەمامەکانی ئێمە؟)) بردنم بۆحەمامێکی سۆنای مۆدێرن... خۆم لەدەرەوە وەستام و ئەوان چوونە ناو. بەڵام هەرزوو گەڕانەوە، کابرا گوتی:

- ئێمە حەمامی تورکیمان دەوێ...

من، کە لە ژیانمدا نەچووبوومە حەمامی دەرەوە و هەر لەماڵەوە خۆم ئەشوشت،!... گوتم:

- بڕوابکەن من شارەزا نیم.

ژنە ئەمریکییەکە گورج کتێبەکەی دەرهێنا. ناونیشانی بەناوبانگترین حەمامی دۆزییەوە و گوتی:

- ئەمە باشترین حەمامی ئەستەمبووڵە. بەیانیان تایبەتی ژنانە و دوانیوەڕۆیان بۆ پیاوانە. بابڕۆین ئێوە لەگۆشەیەکدا ڕاوەستن تامن دەچمە حەمام و دێمەوە!

ژنەمان بردە ئەو حەمامەی کە خۆی پیشانیدابووین. کابرای ئەمریکی گوتی:

- با ئێمەش بڕۆینە قاوەخانەیەك و خۆمان خەریکی تاوڵەیەك بکەین...

- من یاریی تاوڵە نازانم.

- من فێرت دەکەم.

- واتە ئێوە دەیزانن؟

- نا... بەڵام لەناو کتێبەکەدا شێوازی یاریکردنی نووسراوە!

بەهەر زەحمەتێك بوو کابرام لە یاریی تاوڵەکردن پەژیوان کردەوە. ماوەیەك بەشەقامەکاندا گەڕاین تا خاتوون لەحەمام هاتەدەر. هێندە چێژی لەحەمامی تورکی بینیبوو، هەر مەپرسە... دوانیوەڕۆ منیش لەگەڵ کابرای ئەمریکی چوومە حەمام و بەبۆنەی ئەو میوانە بێگانەیەوە یەکێ لەئاسەوارە کۆنەکانی وڵاتی خۆم بینی. شەویش

بۆ ڕاوی ماسیی ((لوفر)) چووین بۆ ((داردانێل)). لەژیانمدا شەوێکی ئاوا خۆشم بەسەر نەبردبوو و لەسەرانسەری ئەستەمبوولێش جێگایەکی ئاوا خۆشم نەدیبوو. فانۆسی بەلەمەکان لەدەریادا هەروەك ئەستێرە گەشەکانی ئاسمان دەدرەوشانەوە... ڕۆژی دوایی لەو مۆزەخانەگەلەی ئەستەمبوولّ، کە من نەیانمدیبوو دیدەنمان کرد. بەراستی لەم وڵاتەی ئێمەدا چەندە شتی عەنتیکە و مێژوویی و سەیروسەمەرە هەن و من ئاگام لێیان نەبووە!... پاشان مزگەوت و ماڵە کۆنەکانمان دیتن... ئەو ڕۆژەی کە دەیانویست بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، کابرای ئەمریکی لێی پرسیم:

- ئێوە خەڵکی ئەستەمبوولّ نین؟!

لەبەر ئەوەی ئەمزانی مەبەستی چییە، لەولامدا گوتم:

- نا... دوو سێ ساڵێك زۆرتر نییە هاتوومەتە ئەستەمبوولّ!

بەسەرسوورمانەوە گوتی:

- چۆن لەم ماوەی سێ ساڵەدا جوانییەکانی ئەم شارەتان نەبینیوە؟

- چونکە من فەرمانبەرم... بەیانیان دەرۆمە ئیدارە و ئێوارانیش لەماڵەوە دەبم!

ژنەکە گوتی:

- ڕاستە... لەناو کتێبەکانیشدا نووسراوە کە ئێوەی فەرمانبەران، چەندە مرۆڤێکی ڕەنجدەرن و لەهەمموو شتێکیش بێبەشن!

کابرای ئەمریکی گوتی:

- بەداخەوە کە وەرزی هاوین نییە. ئەگینا تۆمان دەبرد بۆ هەوارگە جوانەکان و هەمموو شوێنێکمان پیشان دەدایت.

میوانەکانم بردە فرۆکەخانە، لەکاتی سواربووندا کابرای ئەمریکی گوتی:

- هاوینی ساڵی داهاتوو دێینەوە و هەمموو جێگەیەکی ئەم شارەتان پیشاندەدەین و زۆرتر و باشتر ئاشناتان دەکەین.

# تکایە مامۆستا

ئەگەر نووسەر بیت، کارەکەت خراپەیەك و چاکەیەکی هەیە... خراپەکەی ئەوەیە کە نووسەر ناتوانێ تەمەنی راستەقینەی خۆی لە جەماوەر بشارێتەوە، چاکەکەیشی ئەوەیە، هەمووان دەزانن هەرگیز رێکناکەوێت نووسەرێك هەرچەندیش بەناوبانگ بێت، (بەتایبەت نووسەرە نەتەوەییەکان و ئەوانەی بۆ گۆڕان و باشترکردنی بارودۆخی کۆمەڵ دەنووسن) دەوڵەمەند ببێتەوە. ئەوان هەم زۆرتر ماندوو دەبن، هەم زووتر لە پێ دەکەون و خامۆش دەبن. هەربەم بۆنەیەوە پێویستیان بەداهاتی زۆر و پاشەکەوت نییە. بەڵام چونکە نووسەرەکان شارەزای چۆنیەتیی خەرج کردنی پارەن و هەر لە سەرەتاوە بەقەناعەت ڕاهاتوون، کەم کەس پێیاندەزانن، کە بێ پارە و دەسکورت و هەژارن.

نووسەری بەناوبانگی ئێمە، ساڵەهای ساڵ بوو لەرێگەی نووسینەوە دەژیا و بێجگە لەوەش هیچ ئیش و کارێکی تری نەدەزانی و بە پاداشتێکی کەم کە لە وتار و کتێبەکانی دەستی دەکەوت، ژیانی دەگوزەراند...

بەڵام ئیشوکاری نووسینیش وەك زۆربەی شتەکان، کە بە ڕابردنی زەمەن دەگۆڕێن، ئاڵوگۆڕی بەسەرداهات و نووسراوەکانی ئەویش کۆن بوون و لە برەو کەوتن...

ئیتر گۆڤارەکان، بەرهەمەکانی ئەویان وەرنەدەگرت و بڵاوکارەکانیش کتێبەکانیان چاپ نەدەکرد. مرۆڤێك پاش ئەو تەمەنە و لەسەروبەری پیریدا، دەتوانێ چی بکات؟ وای بیردەکردەوە ئەستێرەی ناوبانگی تادوایین کاتی تەمەنی دەدرەوشێتەوە.. بەڵام بەداخەوە زوو کوژایەوە و تەنیا شتێك لەو هەموو ئیش و کار و ناوبانگە بۆی مابۆوە، ڕێز و نرخ و بایەخێك بوو کە خوێنەرە بەوەفاکانی بۆی قایل دەبوون. کاتێ بەشەقامەکاندا دەڕۆیشت، هەندێکەس ئاماژەیان بۆدەکرد و پیشانی یەکتریان دەدا و باسی بەرهەم و کارەکانیان دەکرد. هەموو هاوکارەکان و دۆستە نووسەرەکانی خانەنشین ببوون و هەندێ گەنج، جێی ئەوانیان گرتبۆوە.

نووسەری بەناوبانگ، هیچ کام لەوانی نەدەناسی بەڵام ئەوان ئەمیان دەناسی و بەمامۆستا بانگیان دەکرد. نووسەری بەناوبانگ، بڕیاریدا سەردانی گۆڤارێکی کۆن بکات کە پێشتر کاری تێدا کردبوو. بەخۆی گوت: ((هەرچی دەبێت بابیێت، دەڕۆم و خۆم دەردەخەم. ڕەنگە بە دیتنم بکەونە یادی ڕۆژگارانی ناوبانگەکەم و بەرهەمەکانم بۆ چاپ بکەن...))

جوانترین جلوبەرگی لەبەرکرد و بەرەولای بارەگای گۆڤارەکە کەوتەڕێ. ڕۆژانی ڕابردوو، کاتێ دەچووە بەردەرگای گەورەی ڕۆژنامەکە، دەرکەوان ڕێزی لێدەگرت و دەرکەی بۆدەکردەوە. بەڵام ئەمڕۆ پێشی پێگرت و لێی پرسی:

- مامە ئیشت بە کێیە؟

کاری بەکێ بوو؟... ناوی کێ بەرێت؟! لەوڵامی دەرکەواندا گوتی:

- ئەمەوێ چاوم بەسەرنووسەر بکەوێت...

دەرکەوان گوتی:

- پێیان بڵێم کێ هاتووە؟!...

نووسەری پیر ناوی خۆی گوت... ئەم ناوە ئاشنا بوو بەگوێی دەرکەوان. بە ڕێزەوە لەجێی خۆی هەستا و گوتی:

- بەسەر چاو گەورەم.

دەرکەوان تەلەفۆنی بۆ سەرنووسەر کرد. ئەویش گوتی ((با تەشریف بهێنێتە ژوورەوە))

نووسەری پیر چووە ژووری سەرنووسەر... تائێستا یەکیان نەدیبوو ،بەڵام ناوی یەکتریان بیستبوو. سەرنووسەر بە ڕێزەوە پێشوازیی لە نووسەری کۆن و بەساڵاچوو کرد. تەوقەیان کرد و ڕووبەڕووی یەکتر دانیشتن. سەرنووسەر گوتی:

- گەورەم! چی مەیل دەکەن؟

- سوپاس، قاوەیەك، بەڵام شەکری کەم بێت.

ماوەیەك بێدەگ بوون. نووسەر چاوەڕوان بوو ،کە سەرنووسەر پرسیاری لێبکات، سەرنووسەریش کە لاوێکی ئاقڵ و ژیر دەهاتە بەرچاو، چاوەڕوان بوو نووسەی پیر قسە بکات. وەلحاسڵ نووسەری پیر بێدەنگییەکەی کۆتایی پێهێنا:

- هەمیشە گۆڤارەکەتان دەخوێنمەوە... باس و بابەتی چاکتان هەیە... کاری ئێوەم بەلاوە پەسەندە!

- ئەوە گەورەیی جەنابتانە مامۆستا...

- هەر بەراستی دەڵێم، کارتان زۆرباشە.
- ڕێزتان هەیە مامۆستا.
- لێرەوە تێدەپەڕیم، گوتم سەردانێکی ئێوەش بکەم.
- گەورەییتان کرد مامۆستا.
- لە کاتم نەگرتی؟!
- تکایە... مامۆستا... ئێمەتان سەربەرز کردووە... مامۆستا...

قاوەیان خواردەوە... چاکی و چۆنی و پیاهەڵدان کۆتایی هات... ئیتر چی؟! نووسەری ناودار نەیدەتوانی بڵێ: ((ئەگەر بتانەوێ دەتوانم بۆتان بنووسم!)) ئاخر، سەرنووسەر دەبێ تێبگا کە نووسەری پیر بۆچی هاتووە و دەبێ لێی بپرسێ: ((مامۆستا چیرۆکی تازەتان نییە بماندەنێ؟)) کەچی ئاوا قسە و ئاماژەیەك، هەر نەکرا. سەرنووسەر هەر لە تەندروستیی ئەوی دەپرسی. کە ئەو قسانەش دواییان هات نووسەر لەجێی خۆی هەستا و گوتی:

- ببوورن کاتی ئێوەم گرت.
- تکایە مامۆستا، تکا دەکەم دیسانەوە گەورەمان بکەن.

کاتێ کە نووسەری پیر لەپلیکانەکاندا دەهاتە خوارەوە، ئاوای بیردەکردەوە، ((مەبەستی چ بوو داوای لێکردم بۆ جاری دووهەم سەری لێبدەمەوە؟ ڕەنگە جاری دوایی بەرهەمێکم لێ داوابکات...)) بەڵام دوو حەفتەیش تێپەڕی و هەواڵێك لەسەرنووسەر نەبوو... نووسەری پیر سەردانی هەموو گۆڤارەکان و تەنانەت ڕۆژنامەکانیشی کرد. لەگەڵ هەندێکیان لەبارەی باس و بابەتی گاڵتەجاڕانە قسەی دەکرد. لەگەڵ چەند کەسی تریشدا باسی چیرۆکی ڕەخنەیی و کۆمەڵایەتیی دەورووژاند. بەڵام هەرهەموویان مشتێك قسەی پووچ و بێ کەڵکیان دەرخوارد دەدا! هەموویان تکایان لێدەکرد: ((مامۆستا، دیار بن.. دیسان تەشریف بهێنن!)) هیچ کەس داوای بەرهەمی لێنەکرد. ئەگەر تەنانەت کارێکی سادە و ئاساییشیان لەرۆژنامەیەکدا پێ بسپاردبا، ژیانی پێ دەگوزەراند...جارێکی تر دەستی کردەوە سەردانیکردنی هەموو گۆڤار و ڕۆژنامەکان، بەڵام هیچ ئاکامێکی نەبوو، بارودۆخی لەبواری ماڵییەوە زۆر ئاڵۆز بوو... لە ڕویشی نەدەهات بەکەسێك بڵێت... چونکە لەدانیشتنی هەمیشەیی ناوماڵ بێزار بوو و لەلایەکیشەوە خۆی هێندە زەعیف و کەلەلا نەئەبینی. بڕیاریدا بۆ جاری سێیەم و چوارەم سەربداتە گۆڤار و ڕۆژنامەکان و بەبێ لەڕوودامان، داوا لەسەرنووسەران و بەپرسەکانیان بکات ئیش و کارێکی بدەنێ ، هەرچەند بچووك و ئاساییش بێت!

جاری یەکەم کەئەو قسەیەی بۆیەکێك لەسەرنووسەرەکان کرد، سەرنووسەر وەك ئەوەی دەرزییەکیان پێدا چەقاندبێت، لەسەر کورسییەکەی هەستایە سەرپێ و گوتی:

- تکایە مامۆستا، ئەستەغفیرەڵڵا... ئەوە چ فەرمایشتێکە... شەرم دەمگرێ بڵێم لەم ڕۆژنامەیەدا ئیشوکارێك هەیە شایانی جەنابتان بێت... مەگەر ئەکرێت کارێکی بچووك بدرێتە بەڕێزتان ؟!

کاتێ نووسەری پیر لە ڕۆژنامە دەچووە دەرێ، دیسانەوە سەرنووسەر وەك جاران پێی گوت:

- مامۆستا دیسان تەشریف بهێننەوە...

نووسەری پیر ڕۆیشتە ڕۆژنامەیەکی تر و لەوێ ڕوونتر ڕای خۆی دەربڕی... ماوەی سێ مانگ دەبوو کرێی خانووی نەدابوو... تا بینەقاقەی چووبووە ژێر قەرز! ئامادەبوو هەرکارێك هەبێت بیکات، هەرچەندە بچووك و ئاسایی بێت. سەرنووسەر، تا ئەو قسەیەی لە زمانی نووسەری پیرەوە بیست گوتی:

- ئەمە ناکرێت مامۆستا... ئێوە خەریکن ئاشکرا سووکایەتی بە ئێمە دەکەن! ئاوا شتێك هەرنابێت! کەسایەتییەکی وەك بەڕێزتان کاری بچووك بکات! ئەستەغفیرەڵڵا...

نووسەری پیر چووە ڕۆژنامەیەکی دیکە و لەوێ زۆر سادە و بێپەردە داوای کارێکی کرد. چونکە دەستی زۆر تەنگ ببوو، تەنانەت جلەکۆنەکانیشی فرۆشتبوو و تەنیا یەك دەس جلوبەرگی بۆ مابۆوە..،. هیوای لەهەموو لایەك بڕابوو:

- بیستوومە ئێوە هەڵەچنتان پێویستە کە بەشەو بتوانێ کاربکات. من حازرم بە شەوان لەئیدارەی ڕۆژنامەدا بمێنمەوە و هەموو لاپەڕەکانی ڕۆژنامە بخوێنمەوە و هەڵەچنیی بکەم.

- تکایە مامۆستا... ئاوا شتێك نابێت. پێگەی جەنابتان زۆر بەرزترە لەو قسانە مامۆستا!...

پێشتر نووسەری پیر بە وشەی مامۆستا زۆر دڵخۆش دەبوو. دواتر تێگەیشت، بۆئەوەی لەخۆیانی دوور بخەنەوە و لە کۆڵ خۆیانی بکەنەوە، ئاوای پێدەڵێن! گەیشتە ڕادەیەك بەبیستنی وشەی مامۆستا حاڵی تێکدەچوو و هەرکەس پێی بوتایە مامۆستا، دەیویست بیخنکێنێ بەڵام بەداخەوە هێز و توانای کاتی لاوێتیی نەمابوو.

## ئاکامی ئەم ڕۆژانە بەکوێ دەگات

هەردووکیان هاوسێ بوون... هیچ کامیان حەزی لە چارەی ئەوی تر نەدەهات... هەردووکیان بەدوای یەکدا خانەنشین کران.. هەردوکیان لە تاقیکارییەکی شانسدا بردیانەوە و هەردووکیشیان بڕیاریان دا پارەکەیان بخەنە کار و مامەڵەی پێوە بکەن و وەك بازرگانێك، ڕۆژبەڕۆژ داراییەکەیان زۆرتر بکەن...

هیچ شارەزاییەکیان لە کاروباری بازرگانی نەبوو ،بۆیە ویستیان سوود لەوانە وەربگرن ،کە شارەزای ئەو بوارەن و ئەزموونیان تێدا هەیە. یەکێکیان فەرمانبەرێکی باجی دەناسی و دەیزانی کە بەهۆی کارەکەیەوە هاتووچۆی ناو بازرگانەکان دەکات و ئاگاداری چۆنایەتیی ڕاز و ڕەمزی بازرگانییە، بۆیە ڕۆیشتە لای و لێی پرسی:

- چ بکەم تا بەم پارەیەم سوودێکی زۆرترم دەستکەوێت؟.

فەرمانبەری باج بەبیستنی ئەو قسانە زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی:

- هەرچی پارەت هەیە بە زێڕی بدە، لەماوەیەکی کەمدا نرخی زێڕ گرانتر دەبێت.

هاوسێی یەکەم کە بڕوا و متمانەی زۆری بە فەرمانبەری باج هەبوو، بەهەموو پارەکەی زێڕی کڕی... هاوسێی دووەم برادەری کابرایەکی پسپۆڕی بواری ئابووری بوو. داوای ڕێنموونیی لێکرد. پسپۆڕی کاروباری ئابووری پێیگوت:

- بایی هەموو پارەکەت ئاسن بکڕە... بەمزووانە نرخی ئاسن دەبێتە دووهێندە. ئەویش بەقسەی پسپۆڕی ئابووریی کرد و بایی هەموو پارەکەی ئاسنی کڕی... دوای ماوەیەك نرخی زێڕ دووئەوەندەی جاران بەرز بووەوە. هاوسێی یەکەم چووە لای فەرمانبەری باج و گوتی:

- - زێڕەکە زۆر قازانج دەکا، بۆچی نەیفرۆشم؟

- بەڵێ بیفرۆشە... ئەم نرخە دوایین ڕادەی بەرزبوونەوەیە...

هاوسێی یەکەم زێڕەکەی فرۆشت و لەسەداسەدی قازانج کرد. لەم مامەڵەیە زۆر ڕازی بوو. ویستی بە ڕێنموونیی فەرمانبەری باج، مامەڵەیەکی بەسوودتر بکات...

نرخی ئاسنیش کە ڕۆژبەڕۆژ گرانتر دەبوو، بوو بە دووهێندە. هاوسێی دووەم ،کە شاگەشکە ببوو، چووە لای پسپۆڕی ئابووری و لێی پرسی:

- ئاسنەکە سوودێکی زۆرم بۆ دەکات، بیفرۆشم؟

پسپۆڕی ئابووری بەجوولآنەوەی سەر ولآمی دایەوە و گوتی:

- زۆر ئاستەمە نرخی ئاسن لەوە زیاتر بەرز ببێتەوە... زوو بیفرۆشە.

ئەویش ئاسنەکەی فرۆشت و لەسەدا سەد قازانجی کرد و بە برادەرە ئابووریناسەکەی گوت: لەبیری مامەڵەیەکی بەسوودتردا بە بۆم، با پارەکەم نەخەوێ.

نرخی زێڕ بەپەلە سەردەکەوت و هاوسێی یەکەم لەوەی کەزێڕەکەی زوو فرۆشتبوو پەشیمان بوو. لەفەرمانبەری باجی پرسی:

- ئەم پارەیە چی لێبکەم؟...

- دیسان زێڕ بکڕە...

نرخی زێڕ گرانتر ببوو. هاوسێی یەکەم هەموو پارەکەی برد و نیوەی جاری یەکەم زێڕی کڕی...

هاوسێی دووهەمیش کەلە فرۆشتنی ئاسنەکە ناڕازی بوو، بە کابرای ئابووریناسی گوت:

- حەیفم کرد ئاسنەکەم زوو فرۆشت، ئەگەر تائێستا بمایە چوارهێندەی قازانج دەکرد.

- بازرگانیی ئەم سەردەمە لەگەڵ هیچ یاسایەکدا نایەتەوە، باشە من چ بکەم؟..باشە ئێستا چ بکەم؟... پارەکەم چی پێ بکەم؟...

- دیسان ئاسن بکڕە... ئاوا بڕوا لەوەش بەرزتر دەبێتەوە...

نرخی ئاسنیش زۆر گرانتر ببوو، هاوسێی دووەم بەهەموو پارەکەی نیوەی جاری یەکەم ئاسنی کڕی...

نرخەکان سات بەسات گرانتر دەبوون... هاوسێی یەکەم لەفەرمانبەری باجی پرسی:

- چ بکەم

- بیفرۆشە دڵنیام نرخی زێڕ لەوە گرانتر نابێ...

هاوسێی یەکەم زێڕەکەی فرۆشت و چەند هێندە قازانجی کرد. لەخۆشیانا سەری لێشێوابوو، ئەگەر زووتر ئەو کارەی دەست پێ کردبا، ئێستا ملیۆنەر بوو!...

هاوسێی دووەم لە برادەرە پسپۆڕەکەی پرسی:

- چ بکەم؟...

- باشترە زوو بیفرۆشی. نرخی ئاسن گەیشتۆتە ڕادەی تەقینەوە. لەوە زیاتر ناڕوات .

ئەویش ئاسنەکەی فرۆشت و خەیرێکی زۆری لێ کرد و لەخۆشیانا بەسەر پێوە نەدەوەستا...

نرخەکانیش هەروا سەردەکەوتن. دوو هاوسێکە دیسانەوە بەقسەی برادەرەکانیان کرد و ئاسن و زێڕیان کڕی ،بەڵام چونکە نرخەکان گرانتر ببوون، بەهەموو پارەکەیان تەنیا توانییان نیوەی جاری دووهەم بکڕن. ئەم گران بوون و قازانج کردن و سوود بردن و دیسان بەو پارە زۆرە نیوەی جاری پێشوو ئاسن و زێڕ کڕینە، هێندە دووبارە کرایەوە، گەیشتە جێگایەك بۆ دوایین جار هاوسێی یەکەم پارچە زێڕێکی بچکۆلەی کڕی و خستییە ناو گیرفانەکەی... هاوسێی دووهەمیش توانیی هەرئەوەندە ئاسن بکڕێ ،کە لە سووچێکی حەوشەکەیدا دایبنێ... کارەکەشیان هەر درێژە پێدا تاوای لێهات ،کە ڕۆژێکیان کڕیاری ئاسن لەماڵەکەیدا خۆی هەڵواسیبوو و نامەیەکی کورتی لەژێر پێیدا دانابوو، تیایدا نوسیبووی: ((هەرچی پارەم هەبوو دام بەم بزمارە زلە تا خۆمی پێهەڵواسم. هیچ کەس بەرپرسیارێتی مردنی من نییە. وەسیەت دەکەم ئەم بزمارە گەورەیە بەسەر گۆڕەکەمەوە دانێن تا خەڵکی دیکە چاوی لێبکەن و پەندی لێبگرن و خەیاڵی بازرگانی و مامەڵەی قەبەقەبە نەکەوێتە مێشکیانەوە. ((تەواو)). لە ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنی کڕیاری ئاسنەکەدا، هاوسێی یەکەم کە کاری کڕین و فرۆشتنی زێڕ بوو، بەشداریی کردبوو. زۆر خەمبار و زویر دەهاتە بەرچاو. کە هۆی ئەو خەمبارییەم لێ پرسی، وەڵامی دامەوە:

- ئەو هاوسێیەمان هەر هیچ نەبێ، بەر لە مردنی بەپارەکەی توانیی بزمارێکی گەورە بکڕێت و خۆی پێ هەڵواسێ. بەڵام من نازانم چ بکەم؟ ئەو زێڕەی کە پاش ئەو هەموو کڕین و فرۆشتنە بۆم ماوەتەوە، ئەوەندە بچووکە کەنازنم لەکوێم داناوە. وابزانم کاتێ خێزانم ماڵەکەی گسك داوە، تێکەڵێ تۆز بووە و بابردوویەتی!!

# هەوارەماڵ

لەماڵەوە، بەهۆی هاروهاجیی منداڵەکان و زرینگەی نەبڕاوەی زەنگی تەلەفۆن کە بۆ ساتێکیش نەدەبڕا و هەروەها قەرەباڵغیی میوان و هەموو ئەو خەڵکە جۆربەجۆرەی کە هەموو کات و ساتێك و بۆ هەر بیانوویەکی چکۆلە دەهاتنە لام، نەمئەتوانی بنووسم... هاتمە سەر ئەو ڕایەی کە جێگەکەیی چۆڵ و بێدەنگ لە ناو باخەکانی شاردا بدۆزمەوە و کەلوپەلەکەی خۆم بەرمە ئەوێ و بەتەنیا لەوێ بم. بۆئەوەی بێ هەراهەرا و دەردیسەریی دۆستەکانم بتوانم بە ئاسوودەیی، شانۆ و چیرۆکی کۆمەڵایەتی بنووسم... تۆزێ گەڕام و پرسیم تاجێگەی دڵخوازی خۆم لەداوێن کێوەکانی باکووری پایتەختدا دۆزییەوە... لەوێ باخچەیەك هەبوو ئەپەڕوانییە ڕووبارەوە. جۆگەلەیەك بەناوەراستیدا تێدەپەڕی و شنەیەکی دڵڕفێن، گەڵا و گیای بەنازەوە ئەشەکاندەوە. بەکورتی، دار و گوڵی ناو ئەم باخە لەگەڵ ئەو دیمەنە جوانەی ناو مێرگەکەدا، هەر نەخوێندەوارێکیشی ئەهێنایە سەر زەوق و هەستی شیعریی ئەهەژان... بەم چەشنە دیارە ئەگەر من بچوومایە ئەوێ، شیعر و نووسراوەکانم زۆر باشتر ئەبوون. لەوەش گرنگتر، نێوان ئەو شوێنە تا شار نزیکەی سەد کیلۆمەتر دەبوو و ئیتر بەهۆی دووریی ڕێگاکە دۆست و ئاشنا نەئەبوونە مایەی زەحمەتم. هەربۆیە گورج ئەو باخچەیەم کڕی، پارەکەیم دا و کۆچم کردە ئەوێ...

ڕۆژانی یەکەم بێجگە جریوەی پەلەوەرە دەنگخۆشەکان، خشەی گەڵا و شنەی شەماڵ، هیچی تر نەئەهاتە گوێم. چێژم لەم بێدەنگییە شاعیرانەیە و ئەو ڕوانگە بەربڵاوە و ئەو دیمەنە جوانە ئەبرد... تەنیا کێشەم کەمیی جێگە بوو، چوونکە لەو زەمینە بەرینەدا تەنیا دوو ژوور و حەمامێکیان دانابوو. منیش ڕەنجبەرێکم گرتبوو، کە کارەکانم بۆ جێ بەجێ بکات و ئەویش جێگەی نەبوو بۆ خەو و حەسانەوە. ئەوە بوو ژوورێکی تر و بەرهەیوانێك و چێشتخانەیەکیشم دروست کرد. سەیوانێکی گەورەشم بۆ بەرهەیوانەکە دروست کرد و خواریشەوە ژوورێکی تر بۆ

ڕەنجبەرەکەم. هەواڵ گەیشتە دۆستەکانم کەگوایە من هەوارەماڵێکی جوانم هەیە و ئیتر کەمکەم ئەوانم لێ پەیدا بوون. ناچار بووم دوو سێ ژووری تر بکەمەوە بۆ میوانەکان. بەرەبەرە کەس و کاری خۆم و خزمەکانی خێزانیشم هاتنە لامان. لەبەر ئەوەی ئەو هەموو میوانە پێکەوە ڕێك نەدەکەوتن و ماڵەوەشمان حەزیان لە چارەی لەمیوانە دۆستەکانی من نەبوو، دیسانەوە چێشتخانەیەکی ترم کردەوە و ژووری خەوەکەی خۆشم گواستەوە بۆ شوێنێکی دیکە... هاتنی میوان هەروا پەرەی دەسەند و ڕۆژ بە ڕۆژ زۆرتر ئەبوون. بەناچار حەوزێکی گەورەم دروست کرد بۆ مەلەکردنی گەورەکان و زەوییەکیش بۆ یاریی منداڵەکان... ڕەنجبەرەکەم پێ ڕا نەدەگەیشت هەم کاری باخەوانی بکات و هەم خزمەتی میوانەکان، باخەوانێکم هێنا کەئەویش ژن و منداڵی هەبوو. دوو ژووری تریشم لەسووچێکی باخەکەدا بۆئەوان کردەوە. لەلایەکیشەوە بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێلی میوانەکان لە دەرەوە نەبن، چەند گاراژێکم کردەوە و کرێکارێکی تریشم گرت بۆکاروباری گاراژەکان و ژوورێکیشم بۆ ئەو کردەوە...

کە سەرنجمدا، دیتم باخەکەم کەم بووەتەوە و وەکوو جاران دیمەنە جوان و بەرینەکانی نەماوە. هەربۆیە ئەو زەوییەشم کڕی کەلەپاڵ باخەکەمدا بووو دامە دەم باخەکەوە و بۆ ئەو کارەیش ناچار بووم باخەوانێکی تر بگرم. ئەو کاروبارە هێندە سەرقاڵی کردبووم کە کاری تایبەتیی خۆم واتە نووسینی کتێب و چیرۆکم لەبیر چوبۆوە. بەیانی تا ئێوارە بەسەر سەری عەمەلە و کرێکارەوە بووم. ئێوارانیش تا بەیانیان دەبوو لەگەڵ میوانەکان خەریکی قسە و باس بوومایە. تەنانەت کاتی خەوتنیشم بۆ نەمابوو. ئەم میوانانە ئەبوونە چەند دەستە: یەکەم، میوانە تایبەتەکانی خۆم. دووەم، میوانە خزمەکانم. سێهەم، میوانەکانی خێزانم. چوارەم، میوانە خزمەکانی خێزانم و پێنجەم، ئەوانەی کە هەرلەخۆوە هاتبوون! بێجگە لەمانە دەستەیەکیش کە بەتایبەتی بۆ سەیری سوورە گوڵە بێ هاوتاکانم دەهاتن، کەم نەبوون و من دەبوو لەخزمەتی هەمووییاندا بام. نەمدەزانی ئاخر و ئاقیبەتی ئەم کارە چۆنە و چۆن ئەتوانم لەشەڕی ئەم هەموو میوانە پڕ دەردیسەرییە خەلاس بم... خەرجیی پشت شکێنی ئەو هەموو میوانانە لەلایەك و دەردیسەری و بەتایبەت تێك هەڵچوونی ئەوان و شەڕ و ئاژاوەیان لەگەڵ یەکتر لەلایەکی ترەوە تەنگی پێ هەڵچنیبووم و ئازاری دەدام... شەوێکیان کە ڕادەی میوانەکان گەیشتبووە سی چل کەس و ئەو باخچە ئارام و بەسەفا و چۆڵ و بێدەنگەی منیان کردبووە هوتێلێکی قەرەباڵغی گەڕۆکان، بڕیارم دا بەجێی بهێڵم. بێدەنگ و بەدزیی ئەوان، جانتاکەمم هەڵگرت و یەکسەر چووم بەرەو ئەنکەرە و ژوورێکی بچووکم لە هوتێلێکی

ئەنکەرەدا گرت و لێی دانیشتم. کە بەیانی لەبێدەنگییەکی دڵنەوازدا لەخەو هەستام، هەستم بەلەش سووکی و حەسانەوەیەکی تایبەت کرد.. ئەو رۆژە دوای چەند مانگ بۆ یەکەمجار بێ ئەوەی کەس سەرم لێ بشێوێنێ یان زرینگەی تەلەفۆن تووڕەم بکات، رۆژنامەی بەیانیانم تا دوادێڕ خوێندەوە ،کە بەسەر مێزەکەمەوە دایاننابوو بۆم و ئەوکاتە واتای ئاسوودەیم وەرگرت. بڕیارمدا بۆهەتاهەتایە لەو هوتێلە نیشتەجێ بم... دوای چەند رۆژ رەنجبەرەکەم بانگ کرد و گوتم: حەق و حسێبی هەموو کرێکارەکان بدات و دەریان بکات. دەرگای باخەکە دابخات و میوانەکانیش جواب بکات. دوو سێ ڕۆژ دواتر ڕەنجبەرەکەم هەواڵی دامێ و گوتی: میوانەکان بەهیچ کلۆجێك نایانەوێ لەوێ بڕۆن و چەند کەسێکیشیان ئیدیعای مڵکیەتی باخەکە ئەکەن! منیش سەرم لێ نایەوە و گوتم: هەرچی ئەکەن بابیکەن. دڵنیا بووم لەبەر خەرجی زۆری ئەوێ ناچار ئەبن بەجێی بهێڵن. پاش حەفتەیەك ڕەنجبەرەکەم هەواڵی دامێ ،کە هەموویان ڕۆیشتوون بەڵام من حازر نەبووم بگەڕێمەوە بۆئەو باخە جوانە. بەنیوەی نرخەکەی فرۆشتم و خۆم لەو هەموو دەردیسەریەی تووشی ببووم، رزگار کرد.

## گوێی کەس نابیستێ

برادەرێکم لێی پرسیم:

- چی مەیل ئەکەی؟

گوتم:

- خواردنەوەیەکی فێنك.

برادەرەکەم بەشەرمەوە گوتی:

- ماوەیەك لەمەو پێش ئاشنایەکمان بووە قوربانیی ئەم خواردنەوانە.

پرسیم:

- بۆچی ... چیی لێهات؟

- ئاخر خواردنەوەکان وەك جاران نەماون. نازانم ئەسیدیان تێدەکەن... خوێیان تێدەکەن... نازانم چ ژەهرەمارێکیان تێدەکەن کە ئاوا مەعیدە و ڕیخۆڵەکان کون کون دەکات...



کارەکانی ئێمە هەموویان پێچەوانەن... تاسەی خواردنەوەیەك ئەکەی، ئەسیدەکەی ڕیخۆڵەت کون دەکات... ئەسید دەکرێ بۆ دەوا و دەرمان و کاری پێویست، ئەوەندە تەڕ و بێ ڕەنگە ئەڵێی ئاوی خواردنەوەیە... ناڕەزاییش دەر ئەبڕین هیچ سوودی نییە ئەوەنەبێ سەر و زمانی خۆمان بیەشێنین. چونکە کەس گوێێ بیستنی نییە. ئێمە ناڵێین گازی ئەسید مەکەنە ناو نووشابەکان، دەڵێین کەمتری تێبکەن با ناوسکمان نەسووتێنێ. تائێستا دەجار شیرفرۆشەکەمان گۆڕاوە. ناوێرین بەهیچ کامیان بڵێین کاکە ئەوەندە ئاو مەکەرە ناو شیرەکەت.

ئەگەر پێشی بڵێین سوودی نییە و سەری خۆمان دێنینە ئێش ،چونکە هیچ کەس گوێی بیستنی نییە...

تۆزێکی مابوو خزمێکمان بمرێ. چونکە شیری گەنیوی خواردبوو... ئەم ماستە خۆماڵیانەت تاقی کردوونەتەوە؟ ئەگەر تۆزێ ئاوی تێبکەی ئەتوانی داری ماڵەکانتی پێ سپی بکەی. نازانم گەچی تێدەکەن یا چ کوفتێکی تری تێکەڵ ئەکەن کەوای لێهاتووە؟... ئێمە چاوەڕوانی ئەوە نیین باشترین ماستمان بدەنێ و هیچی تێکەڵ نەکەن، تەنها ئەمانەوێ خاوێن بێت و نەبێتە هۆی نەخۆش خستن و کوشتنی خەڵك. بەڵام ئایا کەسێك سەرنج ئەداتە ئەم شتانە؟ ناء ... بەوخوایە گوێی کەس نابیستێ... ئەگەر دەمیش بکەینەوە و شتێك بڵێین، تەنیا سەری خۆمانمان هێناوەتە ئێش...

(لە جیاتیی بەڕێوەبەری گشتی)

هەموو ڕۆژێ تووڕە و زویر لەماڵ ئەچووە دەرێ. ڕێك نەکەوتبوو ڕۆژێك وەك مرۆڤە بەختەوەرەکان بەبێ شەڕ و هەرا ماڵ بەجێ بهێڵێ... بەستەزمانە تاوانی نەبوو، داهاتی کەم بوو... حەقدەستی بەشی هیچی نەدەکرد... ماڵی نەبوو. کەلوپەلی ناوماڵی ڕێك و پێك نەبوو... خەرج و دەخڵی وەك یەك نەبوون. ئەی ئەم هەموو گیروگرفتە بۆ دەس پێکردنی شەڕ و هەرا بەس نییە؟...

بەیانی کەلەخەو هەستا یەکەم تووڕە بوونی لە ئاودەستخانەکەوە دەستی پێ کرد... بانەکەی چکەی ئەکرد... ئەچووە هەر سووچێك دیسان چکەی لێ ئەکەوت. بەلۆعەی ئاوەکەیان بەتاڵە بەنێ بەستبوو، کە کردییەوە، ئاوەکە بەسەر و ڕوویدا پژا.. نەیئەتوانی بەلۆعەکە ببەستێتەوە... لەدڵی خۆیدا گوتی: ((ئەمە چ گاڵتەجاڕییەکە؟...)) بەتووڕەیی و بۆڵەبۆڵ هاتەدەر تالەماڵ هەڵێت و بچێتە دەرەوە... هەمیشە لەگەڵ خێزانیدا شەڕیان بوو... ژنەکەی بەجۆرێك و منداڵەکانیشی بەچەشنێك یتر. ماوەیەك گەڕا بۆ سابوون و نەیدۆزیەوە... قیڕاندی:

- سابوونەکە لەکوێیە؟

ژنەکەی لەچێشتخانە بەبۆڵەبۆڵ گوتی:

- چیتە؟ بۆهاوار ئەکەی؟
- سابوونەکەتان لەکوێ داناوە؟

ژنەکەی سابوونی جل شۆرییەکەی فڕێدایە بەردەمی:

- ها... بگرە و هێندە مەقیڕێنە...

کاتێ بۆ نانی بەیانی چووە سەرمێز، کورسییە شکاوەکەی بەرکەوت... منالّی ئەمڕۆ ژێر نین و ڕێزی دایك و باوکیان ناگرن... هەمیشە ئەو کارە ئەکەن و کورسییە شکاوەکە دائەنێن بۆ باوکیان. بۆئەوەی زۆرتر تووڕە نەبێ هیچی نەوت. ئارام ئارام بەسەر کورسییەوە دانیشت. قورسیی خۆی دابووە لایەکی کورسییەکە تاوەکوو نەکەوێت. بەپەلە چەند تیکە نانی وشك و چایەکی زەردی خوارد و هەستا. کە ویستی لەدەرکەکە بچێتە دەر، ژنەکەی داوای پارەی لێکرد. ئەویش هەردوو دەستی کردە ناو گیرفانی کورتەکە دڕاوەکەی و گیرفانەکانی دەرهێنان و دایتەکاندن و گوتی:

- وائەزانن کارخانەم هەیە و پارە چاپ ئەکەم؟

دیسانەوە بەتووڕەیی لەماڵ هاتەدەر و کەوتەڕێ بەرەو فەرمانگە... بیست و سێ ساڵ تەمەنی فەرمانبەریی، هەر بەم چەشنە تێپەڕ ببوو.. ژن و منداڵی هەقیان بوو... بەڵام خۆیشی تاوانی نەبوو... مووچەخۆرێکی پلە نزمی فەرمانگەیەك هێندە داهاتی نابێ سکی ژن و منالّی تێربکا... لەم ماوە دوور و درێژەدا ژنە بێچارەکەی تەنانەت ڕۆژێکیش ئاسوودە نەبووە. بەتایبەت ئەم سۆبە خاوەن مردووەش چەندە ئازاری ژنەکەی داوە، تا شنەبایەك ئەهات، دووکەڵێکی ڕەش لەلوولەکەیەوە ئەهاتەخوار و ژوورەکەی پڕئەکرد... درزی لوولەکەیان بەخۆڵەمێش گرتبوو کەچی دووکەڵ هەرئەهات و نەشیان ئەزانی لەکوێوە دێ کە ئاوا هەموویان ئەخاتە کۆخە... نەیدەوێرا بەو چارە ڕەشییە بڵێ ژیان... کە لە ژوورەکە هاتوچۆی ئەکرد، دارەکان قرچەقرچیان لێ هەڵدەستا... ئەبوایە زۆر هێواش و لەسەرخۆ بەپلیکانەکاندا بچوبایەتە سەر، هێندە ئەلەرزین، هەرئان مەترسیی ڕوخانیان هەست پێدەکرا... لەوانەش خراپتر کاسە و کەوچکی چێشتخانەکەیان بوون ،کە کەس بێزی نەئەهات شتیان تیا بخوات.

گەیشتە فەرمانگە... چاك و چۆنیی لەگەڵ هاوکارەکانیدا کرد و لەپشت مێزەکەیەوە دانیشت و کارە دواکەوتووەکانی لەناو مێزەکەیدا دەرهێنان. ویستی دەستیان پێ بکا کە خزمەتگوزار هاتە ژوور و پێی گوت:

- جەنابی بەڕێوەبەری گشتی بانگتان ئەکەن.

- بانگی من ئەکەن؟

- بەڵێ.

- چی بووە؟ جەنابی بەڕێوەبەری گشتی چ کارێکی بەمن هەیە؟

لەجێی خۆی هەستا. چاویلکەکەی ڕێك و پێك کرد. دووگمەی کراسەکەی بەستن و کەوتەڕێ بەرەو ژووری جەنابی بەڕێوەبەر... لەڕێدا بەخۆی دەگوت: ((نەکا شکاتیان لێ کردبێ؟)) چونکە قەرزاری نانەوا و قەساب و دوکاندار و وردەفرۆشی گەڕەکی خۆیان بوو. حسێبی قەرزی کرێ خانوو لەدەستی دەرچوبوو و هەرمانگ، شکاتێکی تازە ئەخرایە سەر دۆسییەکەی... کەگەیشتە پشتی دەرگاکە شانی هەڵتەکاند و لەدڵی خۆیدا گوتی: ((هەرچی ئەبێ با ببێ... من کە خنکاوم ئیتر چ بستێك و چ سەد بستی ئاو...)) بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ دەستێکی بەسەریدا هێنا و دوو سێ تاڵە قژەکەی ڕێك و پێك کردن. یەخەی پاڵتۆکەی کردەوە و دیسان بەستییەوە... لە کرانەوەی پەیتاپەیتای گرێی بۆینباغەکەی بێزار بوو. بەتووڕەیی بەستییەوە و گوتی: (( بەلەعنەت بی، چەند چرکەیەك بەسەرەوە بوەستە...))

(( تەق ... تەق...)) چەندجار لەدەرگای بەڕێوەبەری دا. ئەوەندە هێواش لەدەرکەکەی دابوو، خۆیشی دەنگەکەی نەئەبیست... دەرگەوانەکە کە چەند هەنگاوێك لەولاتر وەستابوو، گوتی:

- فەرموون بڕۆنە ژوورەوە...

بە قسەی دەرکەوان تووڕە بوو... سەیرێکی پشتەوەی کرد و بەلای سەرەوەی چاویلکەکەی سەیرێکی سەرتاپای دەرکەوانی کرد و بەبێزەوە گوتی:

- کەس پرسیاری لەتۆ نەکرد... من خۆم ئەزانم چی بکەم...

پاشان لەسەرخۆ دەرگاکەی کردەوە... سەری بردە ژوور و ئارام ئارام چەند هەنگاوێك چووە پێش. جەنابی بەڕێوەبەر خەریکی ئیمزا کردنی نامەکان بوو... ئەیویست بگەڕێتەوە ،بەڵام کارلەکار ترازابوو. بەدەنگێکی لەرزۆك گوتی:

- گەورەم ئەمرێکتان هەبوو؟

جەنابی بەڕێوەبەری گشتی سەری بەرز کردەوە. کە ئەوی دی بزەیەکی تایبەتی هاتێ.

- ئا... ئا... ها... بەڵێ بەڵێ...

دەنگی بەڕێوەبەر فەرمان پێکردنی پێوە دیار بوو... تاوێك بێدەنگ بوو پاشان گوتی:

- سبەینی ڕێوڕەسمێکی سەر قەبرانمان ئەبێت...

هەستی کرد قسەکانی بەڕێوەبەری بە پێچەوانە بیستوون. لەدڵی خۆیدا گوتی: ((چییە؟)).

دەنگی بەڕێوەبەر، ئەوی لەدەریای خەیاڵات دەرهێنا:

- پێویستە تۆ بە نوێنەرایەتیی ئەم فەرمانگەیە بەشداریی ئەم ڕێوڕەسمە بکەیت.

بەڕێوەبەری گشتی بێدەنگ بوو و ئەمیش دیسانەوە نوقمی دونیای خەیاڵات بووەوە: ((جەنابی بەڕێوەبەر چی ئەڵێ؟... من ئەبێ لەڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنی کێدا بەشداری بکەم؟)). بەڕێوەبەری گشتی گوتی:

- تێگەیشتی؟
- بەڵێ گەورەم تێگەیشتم.
- تۆ ئەبێ لەوێ لەجێگەی من و بەناوی منەوە قسە بکەی... تێگەیشتی؟
- بەچاوان گەورەم.

دەستەکانی خستە ئەملاولای، نەکرا... خستنیە سەر ناوکی، نەکرا... ویستی بیانخاتە سەر سینگی، نەیتوانی، وەك بڵێی ئەو دەستانە هی ئەو نەبوون... هەرچۆنێك بوو دەمی کردەوە و پرسیی:

- گەورەم! ئەم ڕێوڕەسمە لەکوێیە؟...

بەپاشەکشە و بەرەو دەرکی دەرەوە خزا، بەڵام هێندە دەستەپاچە بوو کە کەوتە ناو ڕەفەی پەروەندەکان و کەمی مابوو هەڵدێرێت و بکەوێتە زەوی. هەرچۆنێك بوو خۆی گرتەوە. لەژێر چاوەوە سەیرێکی کرد. دیتی جەنابی بەڕێوەبەر قاقا پێدەکەنێ. بەهەر دەردیسەرییەك بوو خۆی گەیاندە دەرگەکە و چووە دەرێ... لەپشت دەرگاکەوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و شانێکی بۆ هەڵتەکاند... ئەتگوت ئەو شان هەڵتەکاندنە لەشی پر کرد لەبا... باڵای بەرزتر و ورگی زلتر بوو و حاڵەتی فەرماندەکانی بەخۆوە گرتبوو.

کە گەیشتە ژوورەکەی، هاوڕێکانی بەدڵنیگەرانیەوە پرسییان:

- چی بووە؟... بۆچی بەڕێوەبەر بانگی کردبوی؟... شتێ ڕوویداوە؟... مەسەلە چییە...

بەحاڵەتێکی وەك بەڕێوەبەرەکان، چاوی بڕییە هاوکارەکانی و زۆر لەسەرخۆ وڵامی دایەوە:

- هیچ نەبووە... بڕیار وایە سبەینێ لەڕێوڕەسمێکی تایبەتدا بەشداربم و لە
- جیاتی جەنابی بەڕێوەبەر قسە بکەم.

ئیتر هیچ کەس قسەی نەکرد و کەس هیچی لێ نەپرسی. بەڵام ئەو حەزی ئەکرد زۆرتر لەمبارەیەوە قسە بکات...

شەو، هەروەکوو جاران بەدەستی بەتاڵ ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ. ((ئایا ئەم چەشنە ژیانە شیاوی ئەوە؟ یەکێك، کە وەکوو نوێنەری بەڕێوەبەری گشتی لەرێوڕەسمیەکدا بەشداری ئەکات، بۆ ئەبێ پارەی پێویستی پێ نەبێ؟)) سۆبەکە دووکەڵی ئەکرد. شووشەی پەنجەرەکان شکابوون و کاغەزیان پێوە لکاندبوون. بۆئەوەی سەرما و سۆڵە نەیێتە ناو ماڵەکەوە، درز و کونی چوارچێوەکانیان بە پەڕۆ شرە گرتبوون. بەخێزانی گوت:

- سبەینێ لەرێوڕەسمێکدا لەجیاتیی بەڕێوەبەر بەشداری دەکەم.

خێزانی لێێ پرسی:

- ئاغە لەچ رێوڕەسمێکدا بەشداری ئەکەن؟
- رێوڕەسمی بەخاك سپاردنە. نازانم کێیە؟

کچەکەی پێکەنی و گوتی:

- بابە وامزانی بۆ لێکۆڵینەوە ئەڕۆی بۆ ئەرووپا!
- دەمت داخە کچێ...

لەسەرخۆ و بەحاڵەتێکی وەك فەرماندەکان چووە ژورەکەی، بۆ لەبەر کەندنی جلەکانی... تەختەکانی ناو ژوورەکە زۆرتر لەجاران لەرەیان ئەهات. کە بەسەر کورسییە شکاوەکەوە دانیشت، وەختەبوو بەپشتا بکەوێ... بەرلەوەی بنوون گوتی:

- جلە تازەکانم دەربێنە!

خێزانی ماندوو و غەمگین وڵامی دایەوە:

- باشە بەیانی دەریان ئەهێنم.
- بەیانی زوو ئوتۆمبێل دێـتە دوام.

ژنەکە بەسەرسووڕمانەوە پرسیی:

- چیت گوت؟ ئوتۆمبێل دێت؟
- ئەی نەتبیست؟ گوتم لەجێێ بەڕێوەبەر ئەبێ لەرێوڕەسمێکدا بەشداری بکەم... خۆ تۆ لەم قسانە تێناگەی...

بەیانی زوو لەخەو هەستا... ڕیشی تاشی...هێشتا بانی کەناراوەکە چکەی ئەکرد و ئاوەکەی ئەپژا بەسەر و ڕوویدا... جلە تازەکانی لەبەرکردن. کاتی نان خواردنی نەبوو، پەیتا پەیتا لەپەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی ئەکرد و لەدڵەوە پرتەی ئەهات: ((ئەی ئەم ئوتۆمبێلە چیی لێهات؟ بۆهێندە درەنگ دەگات؟)) دوگمەیەکی قۆڵی پاڵتۆیەکەی هەڵکەنرابوو. ژنەکەی

بانگ کرد بیلکێنێتەوە. ژنە خەریکی لکاندنەوەی دوگمەکە بوو کە ئوتۆمبێلەکە گەیشت. شۆفێرەکە لەدەرگای دا و کچەکە دەرگای لێ کردەوە شۆفێرەکە گوتی:

- بە گەورەم بڵێن فەرموون ئوتۆمبێل ئامادەیە.

شۆفێر جلێکی ڕەشی یەخە بەستراوی لەبەرکردبوو و کڵاوی تایبەتی لەسەر کردبوو... کەکچەکەی هاتەژوور و هەواڵی هاتنی ئوتۆمبێلەکەی پێ ڕاگەیاند، زۆر لەسەرخۆ گوتی:

- باشە.. وا دێم.

بە ئەنقەست ماوەیەك خۆی خافڵاند تا کچەکەی و ژنەکەی و هاوسێکانیان، ئوتۆمبێلی ڕەسمی و شۆفێرەکەی ببینن... وەك بەڕێوەبەرە گشتییەکان لەماڵ چووەدەر... شۆفێرەکە بەرێزەوە دەرکی ئوتۆمبێلەکەی بۆکردەوە و ئەویش بەدەم شۆفێرەکەوە پێکەنی و سەرکەوتە پشتەوەی ئوتۆمبێلەکەوە... لەرێدا فەرمانبەرەکانی پۆلیس دەستیان بۆ بەرزئەکردەوە و ڕێزیان لێ دەنا. نە یەکێك... نە دەیان... لەسەدیش تێپەڕئەبوون. تەنانەت خەڵکی تریش تا ئەویان ئەدی رادەوەستان و سڵاویان لێ ئەکرد. لە شۆفێرەکەی پرسی:

- ئەمانە ناسیاری ئێوەن؟

- نا گەورەم.

- ئەی ئەو سڵاوکردنەیان بۆ چییە؟

- بۆ ئوتۆمبێلی حکومییە.

- ئا... وا... واتە، هەموویان ئەم ئوتۆمبێلە رەسمییە دەناسن.

ئیتر زۆر بە ئاسایی و خۆماڵیانە لەوەڵامی ئەو ڕێز و سڵاوکردنانەدا سەری ئەلەقاند و بزەی ئەهاتێ و جار و باریش بەدەنگی بەرز وڵامی ئەدانەوە. ئوتۆمبێلەکە لەگوێ چۆمی تۆپخانەدا وەستا. شۆفێرەکە گورج چووە خوار و بەرێزەوە دەرکەی بۆ کردەوە و ئەویش وەك بەڕێوەبەرێکی گشتی لەئوتۆمبێلەکە دابەزی. لەگوێ چۆمەکەدا بەلەمێکی جوان، راوەستابوو. دووکەس بەرێزەوە وەستابوون... لە وڵامی سڵاوی سەربازیی ئەواندا سەری لەقاند. کاتێ ویستی سەرکەوێت، دوو کەسەکە ژێر باڵیان گرت و ئەویش سەرکەوت... ((چ بەلەمێکی چاکە!))... لەناو ئاوەکەدا بەفشەفش تێەپەڕی، نەك ڕۆیین... هەرباڵی گرتبوو. وەك برووسکە ئەیدا بەلای کەشتییە گەورەکاندا. (( بەخخ... چ قەرەوێڵەیەکی باشی لێیە... ئۆخەی... چەندە نەرم و خۆشە... ئەمە چییە؟... ئەها... ڕادیۆیە؟)) هەمموو شوێنێك لەپاکی و خاوێنیدا بریقەی دەهات. بنمیچەکان بە وێنەی جوان ڕازابوونەوە. پەردەکان لە ئاورێشم

دروستکرابوون... ناوەوەی ژوورەکە بە فەرشی نەرم نەرم رایەخ کرابوو، کە پێت لەسەر دائەنا ئەچووە ناو نەرماییەکەیانەوە. ماوەیەك دەستی بە پەردەکاندا هێنا... ناوەوەی ئەو بەلەمە هەر لەکۆشکێکی بچکۆلە ئەچوو... (( ـــ ئاوا... بەمە ئەڵێن ژیان... نەك ئەوەی ئێمە...)) لە سەر بەلەمەکە مۆبلی حەسیری چنرابوون. بەسەر مۆبلێکەوە دانیشت و لاقی لەسەریەك خستن... بەڵام ئۆقرەی نەئەگرت، هەر هەڵدەستایە سەرپێ و دائەنیشتەوە. دیسانەوە گەڕایەوە بۆ سالۆنەکە. شووشەکان هێندە خاوێن بوون کە کاتێ سەیرت ئەکرد هەستت پێ نەدەکردن... دیمەنی دارستان و ئاسمان و ئاو، لەدوورەوە هێندە جوان و دڵڕفێن بوو، کەس نەیئەتوانی ساتێکیش چاویان لێ وەرگێڕێ. چەپکە گوڵێکی زۆر گەورە و جوان و ڕەنگین لەوێ دانرابوو، کە تایبەت بوو بۆدانان لەسەر گۆڕی مردووەکە... پارچەیەکیان کێشابوو بەسەردا و لێیان نووسیبوو، ((دیاریی بەڕێوەبەری گشتی...)) دیسانەوە سەیرێکی ئەم لاولای کرد... چەند دوگمەی زەنگ بەدیوارەکەوە بوو. دەستی بەیەکێکیاندا نا... گورج خزمەتکارێك هاتە ژوورەوە. کڕنۆشی بۆ برد و پرسیی:

- فەرمایشێکتان هەبوو گەورەم؟
- هین... لێرە ئاودەست هەیە؟
- بەڵێ گەورەم... تکایە لێرەوە.

هیچ کارێکی بەوێ نەبوو. کەچی کاتێ چووە ناوەوە حەزی نەئەکرد بێتە دەر. بەلۆعەی ئاوەکەی کردەوە و بەستییەوە. چەندجار ڕوانییە ئاوێنەکە. هەموو شوێنێ سپی و خاوێن بوو.. بەلەمەکە گەیشتە جێ و وەستا. دوو فەرمانبەر چەپکە گوڵەکەیان هەڵگرت و لە بەلەمەکە بردیانەدەر. حەشیمەتێکی زۆر لەبەردەمی ئەو مزگەوتە وەستابوون کە جەنازەکەی لێ بوو. چەپکە گوڵێکی زۆریش لەوێ ئەبینرا. لەسەرخۆ بەشوێن چەپکە گوڵەکەدا کەوتەڕێ. هەڵسوکەوتی، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ بەڕێوەبەرێکدا نەبوو. چەپکە گوڵەکەی لەسەر گۆڕەکە دانا. بیری بەلای بەلەمەکەوە بوو، حەزی ئەکرد ڕێوڕەسمەکە زووتر کۆتایی پێ بێت. دوای تەواوبوونی ڕێوڕەسمەکە بەپەلە سواری بەلەمەکە بوو و کەوتنە ڕێ... کاتێ بەلەمەکە بەلای کەشتییەکاندا تێدەپەڕی، وای ئەزانی خۆیەتی ئەو کارە ئەکات. ئەوانەی ناو کەشتییەکە بەتاسەوە سەیری ناو بەلەمەکەیان ئەکرد و لەدڵەوە دەیانگوت: ((خۆزگە ئێمەش لەناو ئەو بەلەمەدا بووایەین.)) کە بەلای ماڵەکاندا تێدەپەڕی، خەڵکەکە بەشەکانەوەی دەست و دەستەسڕ، سڵاویان لێ ئەکرد. ڕۆیشتە جێگەی لێخوڕی بەلەمەکە... ئەویش بەڕێزەوە لەبەری

هەستا و سڵاوی لێ کرد. لە دڵی خۆیدا گوتی: (( کاپیتان وا ئەزانێ من کێم؟ ئەگەر بیزانیبا فەرمانبەرێکی سادەی فەرمانگەم هیچ ڕێزێکی بۆ دانەئەنام.)) بەحاڵەتێکی تایبەتی گوتی:

- بەلەمێکی زۆر باشە!
- بەڵێ گەورەم لەچاکترین بەلەمەکانی جیهانە.
- ئەگەر دەنگ نابێ برۆینە ناوەڕاستی دەریا و کەمێك بگەڕێین...
- فەرمانی جەنابتانە گەورەم

کاپیتان سەری بەلەمەکەی بەرەو دەریای ڕەش وەرگەڕاند، ئەمیش لە دڵی خۆیدا دەیوت: ((ئەم بەلەم سواریەی ئەمڕۆ ژیانی منی شێواند... خۆزگە ئەم وەزعە ڕووی نەدابا، بامن نەمزانیبا خەڵکی دیکە چەندە ژیانیان خۆشە!)) هەرچی ئەچوونە پێش، دیمەنی دەریا جوانتر ئەبوو. لەرینەوەی بەلەمەکەش لەسەر ئاوەکە دلگیرتر ئەبوو. هەوا کەم کەم تاریك دائەهات، کاپیتان گوتی:

- ئیزن ئەفەرموون بگەڕێینەوە بۆ ناو شار؟
- بەڵێ بگەڕێوە... رادیۆکەش بکەوە!

رادیۆ گۆرانییەکی خۆشی بڵاودەکردەوە کە ئەو خۆشییەی سەدچەندان دەکرد. پەیتا پەیتا دەستی بەمێزەکاندا دێنا و وەك کەسایەتییە گەورەکان بەسەر مۆبلەکانەوە دائەنیشت...

کە بەلەم گەیشتە جێ، دووکەس ژێربالّیان گرت و یارمەتییان دا تا دابەزێ. کاتێ پێی خستە سەرزەوی یەکێك هات و پێی گوت:

- جەنابی بەڕێوەبەر چاوەڕوانی ئێوەن.

تەزوویەکی بەلەشدا هات و راچەنی، ((یانی چی؟... جەنابی بەڕێوەبەر تائێستا لە فەرمانگە ماوەتەوە؟... ئای... بەدبەخت بووم، لەسەر کار دەرم دەکات...))

بەهەر زەحمەتێك هەبوو خۆی گەیاندە پشتی دەرکی بەڕێوەبەری گشتی و تەق ... تەق ... تەق لەدەرکەکەی دا.

- فەرمووون. بێنە ژووورێ...

لەدەنگی بەڕێوەبەری گشتی تێگەیی کە زۆر تووڕەیە... چووە ژوور... بەڕێوەبەر گوڕاندی بەسەریدا:

- تائێستا لەکام جەهەننەمدا بووی؟

زاری بەسترابوو... دەنگی لێ دەرنەئەهات... بەڕێوەبەری گشتی دیسانەوە پرسیی:

- ئەم هەموو وەختە لەکوێ بووی؟

ئەو کابرا زەبەلاحە سەری خستبووە خوار و دڵی پڕ ببوو... فرمێسك لەچاوەکانی دەتکایە خوار و نەیئەزانی چی بڵێ... بەڕێوەبەر گوتی:

- بۆچی ئەگری؟... وەڵامم بدەوە...

بەهەنسکە هەنسك وەڵامی دایەوە:

- گەورەم. ئێوە ئەم هەموو فەرمانبەرەتان هەیە بۆچی منتان بۆ ئەم کارە هەڵبژارد؟ بۆچی چارەڕەشتان کردم؟

بەڕێوەبەر بەسەرسووڕمانەوە پرسیی:

- من بۆچی ئێوەم بەدبەخت کردووە؟

- گەورەم! من تا ئێستا ئەو شتانەم نەدیبوون. چێژی سواربوونی ئوتۆمبێلی تایبەتی و بەلەمم نەچێژابوو. نەمئەزانی ئاوا شتگەلێکی جوان جوانیش لەم دنیایەدا هەن. پێم بەقەدەر بەرەی خۆم رادەکێشا، ئەگەر ئەو چەند فلسەی حەقدەستم تۆزێك زۆرتر ئەبوو، بەتەواوی خۆشبەخت ئەبووم... بەڵام ئێستەودوا، هیچ شتێك ناتوانێ خۆشحاڵ و بەختەوەرم بکات...

- قاقای بەڕێوەبەری گشتی بەرز بووەوە. نەیئەتوانی وەزعی ئەو دەرك بکات. هەروا کە ئەو تا ئەمڕۆ نەیئەزانی ژیان چییە و نەیشی دیبوو چ شتگەلێکی جوان و بەنرخ لەم دنیایەدا هەن؟!.

# جانتا دز

ئافرەتێکی جوان و تەرپۆش بەسەر پردە گەورەکەی ئەستەمبوولەوە ئەیقیژاند:

- ئەی هاوار... فریام کەون... جانتاکەی بردم... مەهێڵن رابکا... ئەو دزە بگرن!

لەچاوتروکانێکا جموجوڵ و هاتوچۆ وەستا. هەموویان ئەیانڕوانییە ئەو شوێنەی ژنەکە دەستی بۆ رائەکێشا. کابرایەکی پێخاوس کە جانتای ژنەکەی ڕفاندبوو زۆر بەپەلە رای ئەکرد و بەسەر پلیکانەی ژێر پردەکەوە چوارچوار و پێنج پێنج بازی ئەدا بۆئەوەی لەدەستی ئەو ژنە و پۆلیس و خەڵکیش هەڵبێ. ژنەش هەروا ئەیقیژاند:

- بگەنە فریام... جانتاکەی بردم... مەهێڵن ڕابکا... ئەی هاوار...

زۆری پێنەچوو پۆلیسێك دەستی لەناو دەستی دزەکەدا لەپلیکانەی پردەکە سەرکەوتن و هاتنە لای حەشامەتەکە، پۆلیسەکە بەفیزێکی ئێجگار زۆرەوە گوڕاندی؟

- ئەم جانتایە هی کێیە؟

ژنە جوانەکە هەرکە چاوی کەوتە جانتاکەی، حەشیمەتەکەی بەزۆر لادا و خۆی گەیاندە لای پۆلیس و گوتی:

- جەنابی پۆلیس هی منە... شوکر بۆ خوا پووڵ و پارەکەم لەکیس نەچوو.

پۆلیس پێشگری لەهەڵاتنی دزەکە، تەنیا قژەدرێژ و شێواوەکانی گرتبوو... چونکە ئەگەر جلوبەرگە شڕەکەی گرتبا یەکسەر ئەدڕان و بەدەستییەوە دەهاتن! دزەکەش بەوپەڕی شەرمەزارییەوە لەبەرانبەری حەشیمەتەکەدا راوەستابوو، دانە چڵکنەکانی لەناو کونی زۆری پانتۆڵە سەربازییەکەیدا بەئاشکرا ئەبینران. پۆلیس گوتی:

- خاتوون تکایە تا بنکەی پۆلیس لەگەڵماندا بێن.

- جا بۆچی؟ خۆ هەموو ئەمانە بەچاوی خۆیان دیتیان ئەم کابرایە جانتاکەی ڕفاندم.

- بەڵی وایە... بۆڵام هاتنی ئێوە بۆ پۆلیس پێویستە، بەپێی یاسا ئەبێ ئەم دزە بدرێـتە دادگا و لەوێشەوە ڕەوانەی زیندان بکرێت.

کە گەیشتن، بەڕێوەبەری پۆلیس پاش ئەوەی قسەی ئافرەتەکەی بیست، بەرق و تووڕەیی و سووکایەتییەکی زۆرەوە چاوی بڕییە دزەکە:

- دانارزێی دزی دەکەی؟ بۆ وەك ئەم هەموو خەڵکە خەریکی ئیش و کارێك نابی؟ ئیش و کار عەیب نییە... دزی شەرم هێنەرە.

دز وڵامی نەدایەوە و هەروا سەری داخستبوو. بەڕێوەبەری پۆلیس درێژەی دایە:

- ئەم کارە ناحەزە ئاخر و ئاقیبەتی نییە... بۆچی تۆ ئەبێ ئاوا کارێکی ناحەزت لێ بوەشێتەوە؟

دزەکە هێواش هێواش سەری بەرزکردەوە و گوتی:

- ئەی چی بکەم گەورەم؟ خۆ لەم وڵاتەی ئێمەدا ئیشوکار دەسناکەوێ.

بەڕێوەبەری پۆلیس بەتووڕەیی بەسەریا گوڕاندی:

- وس بە، دەمت داخە... دزیت کردووە و خەریکی قسەی قۆڕیش ئەکەی؟ تا پرسیاریان لێ نەکردووی دەمت مەکەوە.

پاشان ڕووی لەخاتوون کرد و گوتی:

- ئەکرێ بفەرموون چی لەناو جانتاکەتاندایە؟

- تۆزێ پارە و ماتیك و ئاوێنە و وردە شتی خۆم.

- پارەکە چەندە؟

خاتوون سەری خستەخوارەوە. بەڕێوەبەری پۆلیس دەستی بۆ جانتاکە برد ،کە بەسەر مێزەکەوە دانرابوو. بەڵام ژنەکە گورج نارەزایەتی پیشاندا و گوتی:

- تکا دەکەم جانتاکەم مەکەنەوە چونکە شتومەکی تایبەت بەخۆمی تێدایە و حەز ناکەم کەس بیانبینێ.

کەچی بەڕێوەبەری پۆلیس بێ ئەوەی گوێ بداتە قسەی ئەو، زریی جانتاکەی کردەوە. جانتاکە هەر ئەو شتانەی تێدابوو کە ژنەکە گوتبووی، بەڵام دووسەد دۆلاریش ئاخنرابووە سووچێکی. بەڕێوەبەر گوتی:

- ئەکرێ بفەرموون ئەم دۆلارانەتان لەکوێ کڕیون؟

- من سکاڵام لە هیچ کەس نییە... تکایە جانتاکەم بدەنەوە بابڕۆم.

- پرسیم دۆلارەکانتان لەکوێ کڕیون؟
- جانتاکەشم ناوێ... ئەویش بۆ خۆتان هەر تەنیا ئیزنم بدەن بڕۆم.
- ناء.. ئێوە ناتوانن بڕۆن... ئەبێ بزانین ئەم دۆلارانەتان لەکوێ هێناوە.

ئافرەتەکە سەری خستەخوارەوە و گوتی:

- هەر سەرلەبەیانی ئەمڕۆ خاتوو ئێلێنی ئەم دۆلارانەی دامێ.

جانتا دز تۆزێ سەری هەڵبڕی و سەیرێکی بەڕێوەبەری کرد و پاشان بزەیەکی پڕ مانا سمێڵە پڕەکانی بزواند. بەڕێوەبەر دیسانەوە ڕووی کردە ژنەکە و پرسیی:

- خاتوو ئێلێنی ئێستا لەکوێیە؟

ئافرەتی جوان و تەڕپۆش لەسەرخۆ ناونیشانی ماڵی خاتوو ئێلێنی دا و گورج بەڕێوەبەری پۆلیس لەگەڵ ئەو و دزەکە و چەند پۆلیسێك بەرەو ماڵەکەیان کەوتنە ڕێ.

کاتێ بەڕێوەبەری پۆلیس ماڵی خاتوو ئێلینی گەڕا و لەهەر شەش ژوورەکەیدا چەندین ژن و پیاوی ڕووتی دەرهێنان، ئەویش بەو وەزعە شپرزە شەرماوییەوە، قیڕاندی:

- کەوابوو تۆ هەر ئەو خاتوو ئێلێنییەیت ،کە ئێمە شەش مانگی ڕەبەقە بەشوێنتدا دەگەڕێین و ناتدۆزینەوە... ئەزانم ئەمە پێنجەمین بنکەی بێ نامووسییە لەم ناوەدا داتمەزراندووە! ئێستا بێ بڕوبیانوو پێم بڵێ ئەم دۆلارانەت لەکوێ هێناون؟
- کاك ڕەزا کە یەکێکە لەمشتەرییەکانم پێی داوم.

بەڕێوەبەری پۆلیس پیاوەکانی لەبەر ئەوەی پیاوبوون بەرێ کردن و ژنەکانی لەبەر ئەوەی ژن بوون ناردنە پۆلیس و ئینجا خۆی و خاتوو ئێلێنی و ژنەکە و دزەکە و چەند پۆلیسێك بەرەو ماڵی کاك ڕەزا بەرێ کەوتن.

کاك ڕەزا بێ ئەوەی ئیزنی لە شارەوانی وەرگرتبێ لە پشتەوەی ماڵەکەیەوە خەریکی بینای خانوو بوو. بەڕێوەبەری پۆلیس بەتووڕەیی لێی پرسی:

- لێرە خەریکی چیت؟
- هیچ گەورەم.
- ئەی ئەم وەستا و کرێکارانە چین؟... بە دزییەوە خانوو دروست دەکەیت؟

جانتا دزەکە دیسان لەژێر سمێڵە پڕەکانییەوە بزەیەکی هاتێ. بەڕێوەبەری پۆلیس دۆلارەکانی پیشانی کاك ڕەزادان و پرسیی:

- باشە بڵێ بزانم ئەم دۆلارانەت لەکوێ هێناون؟

- گەوەرم ئەوانەم لەعەلی ئاغە وەرگرتوون.

بەرپرسی پۆلیس بەتەلەفۆن داوای ئۆتۆمبێلی لە بنکەی پۆلیس کرد. کە ئوتۆمبێلەکە گەیشت بەڕێوەبەر و ژنە تەرپۆشەکە و دزەکە و خاتوو ئێلێنی و کاك رەزا سواربوون بەرەو ماڵی عەلی ئاغە.

کە گەیشتن، بەرپرسی پۆلیس لەعەلی ئاغەی پرسی:

- تۆ ئەم دۆلارانەت داونەتە کاك رەزا؟
- بەڵێ گەورەم.
- بۆچی پێـتداوە؟
- ئاسنی قاچاخم لێێ کڕیوە.

بەڕێوەبەر ڕووی کردە ئاغەڕەزا و وتی:

- کەوابوو تۆ لەو دەستەیەشی بازاڕی ڕەش بۆ ئاسنیش دروست دەکەن... پاشان ڕووی کردە عەلی ئاغە و لێێ پرسی:

- بڵێ بزانم تۆ ئەم دۆلارانەت لەکوێ هێناون؟
- دوو شەوی پێشتر لەماڵی حسێن ئاغەم هێنان.

دزەکە بزەیەکی تری هاتێ. هەموویان کەوتنەڕێ بەرەو ماڵی حسێن ئاغە. کە گەیشتنە ناو دیوەخانە گەورەکەی حسێن ئاغە، دیتیان بەسەر مێزە گەورەکەیەوە دەهەزار دۆلار و چەند دەست وەرەقی پاسوور پرژ و بڵاون. بەڕێوەبەر پاش ئەوەی ٨ کەس لەقوماربازەکانی رەوانەی زیندان کرد، لەحسێن ئاغەی پرسی:

- باشە تۆ بڵێ بزانم ئەم دۆلارانەت لە کوێ هێناون؟
- نووری خان پێی داوم... وابزانم ئەویش لە کەشتییەوانێکی بێگانەی وەرگرتبێ.

بەڕێوەبەری پۆلیس هەمووانی لەگەڵ خۆی بردن بەرەو ماڵی نووری خان، پاش ماوەیەك گەڕان و پشکنین، دە کیلۆ هێرۆینیان لەماڵی نووری خان دۆزییەوە. نووری خان وێڕای دانپیانان بە تاوانەکانیدا گوتی:

- لە ئیحسان خانم وەرگرتووە ،کە کارگەیەکی گەورەی دروستکردنی هیرۆیینی هەیە.

بەڕێوەبەری پۆلیس ئیحسان خانیشی گرت و لێی پرسی:

- ئەی تۆ ئەم دۆلارانەت لەکوێ هێناون؟
- من لەئاغە ڕەزاقم وەرگرتن.

- ئاغە رەزاق کێیە؟
- ئاغە رەزاق قاچاخچییەکە لە بەیروت جلوبەرگی قاچاخی ژنان ئەهێنێ.

دزەکە سەری بەرزکردەوە و بۆ چەندەمین جار بەدەم بەڕێوەبەری پۆلیسەوە پێکەنی. جەماعەت بەرەو ماڵی ئاغە رەزاق کەوتنەڕێ. ئەویش وتی دۆلارەکانی لەخاتوو نەوین وەرگرتوون ،کە مایۆی ژنانە هاوردەی ناو وڵات دەکات.

بەڕێوەبەری پۆلیس ئەیویست بکەوێتە شوێنی نەوین ،بەڵام هەواڵیان پێدا کەئەو لەپاریسە و ناشگەڕێتەوە بۆ وڵات. بەڕێوەبەر سنگی خۆی ساف کرد و گوتی:

- زۆر باشە کە لێرە نییە ئەگەر لێرە بوایە لەناو ئوتۆمبێلەکەدا جێمان بۆ ئەویش نەدەبووەوە.

دزەکە ویستی دیسانەوە پێبکەنێ ،کەچی بەڕێوەبەری پۆلیس بەسەریا گوڕاندی:

- بەستە ئیتر... ئەوەندە پێمەکەنە... بۆم دەرکەوت تۆ سەبارەت بەهەموو ئەمانە مرۆڤێکی بەشەرەفتر و پاکترو ئابروومەندتریت!

سەرەنجام جانتا دزەکە بەتاوانی دزی، هەشت مانگ زیندان کرا و ئێستاش چەند رۆژێکە ئازاد کراوە و ژیانێکی پاك و ئارامی دەست پێکردووە و هەرکات چاوی بە جانتایێکی ژنانە بکەوێت، وەك ماری بینیبێ، تا ئەتوانێ ڕائەکات و لێی دوور دەکەوێتەوە.

# ڕێوڕەسمی کردنەوە (افتتاح)

کابرایەکی زل و خۆشپۆش، دڕنی بە ریزی دانیشتوان دەدا و بەپەلە ئەڕۆیشت تا خۆی گەیاندە ئەو کابرا تەرپۆشەی لە سووچێکدا بەتەنیا وەستابوو و هەموو لەشی شەلاڵی ئارەقە ببوو. کاتێ گەیشتە لای گوتی:

- لەوانەیە زۆر چاوەڕوانم هێشتبیتەوە و تووڕەبووبی و وات زانیبێ ئیتر نایەم... بۆ درەنگ کردنەکەم داوای لێبوردن دەکەم.

- تکایە بەڕێز... چۆن ئەبێ لەئاوا رۆژێکی پیرۆزا گلە و بناشت لێکدی بکەین؟

- ئەمڕۆ من زۆر سەرقاڵم چونکە ئەرکی میوانداریتییان پێ سپاردووم. منیش لە شوێنی قەڵەبالغ ناڕاحەتم و سەرم لێ تێکدەچێ. رەنگە ئەوانەی نامناسن وابزانن تەمبەڵ و هیچ لێ نەهاتووم... پێدەچێ ئێوەش لێرە زۆر بە تەنیا مابنەوە وانییە؟

- ناء بەڕێز... گوێم لە وتەکانی ئەو گوتاربێژە گرتبوو... ناوی چییە؟

کابرا سەری بردە بن گوێی و پچەیەکی کرد... ئەویش بەبیستنی ئەو قسانە سەری سوورما و گوتی:

- کوڕە نابێ...

- بەڵێ خۆیەتی... زۆر ماندووبووین تا رازیمان کرد.

گوتاربێژ بەوپەڕی لێزانییەوە قسەی دەکرد و هەستی هەموو میوانەکانی بزواندبوو. ئەوکاتانەی چەپڵەیان بۆ لێدەدا، هەڵەکەی دەقۆستەوەو دەیگوت:

- هەر تەنیا بەقسە ناکرێ وڵاتەکەمان بکەینە وڵاتێکی پیشەسازی، میللەتێك کە ناتوانێ گەنمی پێویستی خۆی، بە دەستی خۆی بچێنێ، لەسەداسەد ناشتوانێ ببێتە خاوەنی پیشەسازی، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم گیروگرفتەشدا ئەمڕۆ ئێمە ئەم

کۆشکە جوانە ئەکەینەوە، وەك یەکەم هەنگاو لەرێبازی بە پیشەسازی کردنی ولاتەکەمان.

کابرای زەبەلاح گوتی:

- بڕوانە لەو کۆشکە جوانە. بە ڕای من ئەم گەلە ئەگەر بیانەوێ ئەتوانن هەموو کارێك بکەن.

- دڵنیام ئێوەش دەزانن ئەمە کارێکی تەواو نەتەوەییە.

- ڕاستە... هاوولاتیانی ئێمە لەکاروانی پیشەسازی دواکەوتوونە... بەلام گرینگ نییە، ماسی هەرکات لەئاو بگیرێ تازەیە.

- پێموایە تا ٣ ــ ٤ مانگێکی دیکە ئەبێ بکەوێتە کار و بەرهەمهێنان، چونکە تائێستاش دوو سێ جار جەژنی کردنەوەمان بۆ گێڕاوە و ڕەنگە دوو سێ جاری تریش هەر بۆی بگێڕین.

- بەلام بە رای من باشتر بوو ڕێوڕەسمەکە بخەینە ڕۆژێك ،کە کارگەکە بە تەواوەتی دەکەوتە کار... ئاوا زۆر باشتر دەبوو.

- ئێمەش رامان لەسەر ئەوەبوو، بەلام کردنەوەی پیشانگای ((حەفتەی کەرەستەی خۆماڵی)) کە چەند ڕۆژێك لەمەوپێش بوو، کارەکەی خستە دواوە.

- کردنەوەی ئەو پیشانگایە بەراستی ئومێد بەخشە... باشە کێ سەرپەرشتیی ئەو پیشانگایە دەکات؟

- کابرایەکی ئینگلیزی...!

- بەراستی کۆشکێکی جوان و ڕازاوەیە.

- بۆ باشترکردن و گەشەی زۆرتری بەرهەمە خۆماڵی و نەتەوەییەکان لە هیچ چەشنە هەوڵ و فیداکارییەك درێغیمان نەکردووە.

- دڵنیام زۆریشتان بۆ خەرج کردووە... وانییە؟

- بەڵێ وایە زۆرمان خەرج کرد... ئەگەر قەرزە دە ساڵەکەی ئەوان نەبوایە کارەکە بە نیوەچڵی دەمایەوە.

- ئەگەر لە دیکەی شارەکانیشدا کارگەی ئەوتۆ بکرێنەوە...

- لە پلانی یەك ساڵەی دووهەمدا لەبەرچاو گیراوە و هیوادارم چەند ساڵی تر ئێمە بچینە ریزی ولاتە پێشکەوتووە پێشەییەکانەوە...

سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد و پاشان بەکابرای گوت:

- وابزانم درەنگە ئەگەر ئیزنم بدەن من دەبێ بڕۆم.

- ناء... ئاوا نابێ... فەرموون با گلاسێك ویسکی بخۆینەوە. پاشان پاکەتێك جگەرەی (سالم)ی لەگیرفانی دەرهێنا و گوتی:

- فەرموون جگەرەیەك.

- سوپاستان ئەکەم. من ئەبێ پێش کاتژمێر دوازدە لە فڕۆکەخانە بم.

- تا کاتژمێر دوازدە دەتوانین دەجاری تریش ئێرە بکەینەوە، جگە لەمانەش... تا کارگەکەمان نەبینن و سەیری ((بار))ە ئەمریکییەکان نەکەن نایەڵم بڕۆن. گرینگتر لەوەش بۆ چێشت لێنان چەند چێشتلێنەری پسپۆڕی ئیتالیم هێناون تەنانەت ،گوتوومە بە شیرینەمەنییەکی بیانی بەسەر کێکە گەورەکەشەوە، وێنەی کارگەکە دروست بکەن. هەرچەند ئەمانە شتی بچووك و منالانە و لاوەکین، بەلام ئەبێ بلێم من لەبەرانبەر کاروباری نەتەوەییدا وەك منالانم لێدێ.

- منیش هەروام. هەرچەندە لایەنی رامیاریمان وەکوو پیشەسازییەکەمان پێشکەوتوو نییە، بەلام من متمانەم بەم خەلکەی خۆمان زۆرە. ئەگەر پێیان بلێی کارگە دروست بکەن، دەیکەن، بلێی بەسەر ئوتۆمبێلەکانەوە خەریکی کار بن، دەبن، بلێی داهاتی کارگەکە بفرۆشن، دەیفرۆشن، بەبیروڕای من ئێمە گەورەترین پالپشتمان هەیە، واتە هەر ئەم میللەتەی خۆمان، بەلام تا ئێستا خۆمان لە پێشخستنی بواری پیشەسازیدا کەمتەرخەم بووینە.

- وایە، راستە.. کەمتەرخەم بووینە.

- خۆ پێشتر کەرەستەی بیانیمان نەبوو، خۆمان شتمان دروست ئەکرد و هەر خۆشمان کەلکمان لێ وەرئەگرت و ئیتر نیازمان بە بێگانەکان نەبوو.

لەم کاتەدا دەنگی وتاربێژ لەبلندگۆکەوە هات و قسەکانی ئەوانی بڕی:

- "ئەم کۆشکە یەکێکە لەگەورەترین کۆشکەکانی شێوازی مۆدێرنی بیناسازی".

کابرا گوتی:

- وابزانم ئەمە جوانترین کۆشکی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بێت؟!

- بەڵێ وایە. ئەو ئینگلیزییانە کارەکەیان زۆر بەباشی ئەنجام داوە. جوان سەیری بکەن، ئەو بەشەی لای دەرگاکەوە بەشی پێشوازیی کۆشکە. ئەولایەش هۆڵی سینەمایە و پشتەوەشی گازینۆیەکی بێ وێنەیە کە بە شێوەی فەرەنسایی دروست کراوە. با ڕێستورانتی (فول تایم) بمێنێ، ئەم کۆشکە ڕێستورانێکی هەیە زۆر جوان و ڕازاوە ،کە بە شەو و ڕۆژ لەخزمەتی میوانەکانایە.

- کەوابوو بیرتان لەهەموو شتێك کردۆتەوە.

- بەڵی وایە... دەرگاکانی ئێرەمان لەئیتالیاوە هێناون.. کەرەستەکانیش لەفەرەنسا.. ئەرکی ڕێك خستنی ئیشەکانیش لەئەستۆی نەمسابییەکانە و داوامان لە بەلژیکایش کردووە ماسوورکەی مەکینەی دروومانمان بۆدروست بکەن و ئەوەتا جاریێ چاوەڕوانی ئەوانین.

- هیوادارم ئەم کارە زووتر بگاتە ئەنجام و ئێمەش لەپیشەنگایەکانی ئەورووپادا بەرهەم و کەرەستەی بەمارکی دروست کراوی تورکیا ( MADE IN TURK) ببینین و بەدونیا بسەلمێنین، ئێمەش میللەتێکی خاوەن پیشەسازی و پێشکەوتووین.

- هیوادارم... هیوادارم پێکەوە سەر لەپیشانگاکەی ئەورووپا بدەین بۆ دیتنی بەرهەمی وڵاتی خۆمان.

- بەڵام کاتێ کارگەکەمان دەستی بەکار کرد، ئیتر لەوەناچێ ئێوە هیچ دەرفەتێکتان بۆ بمێنێ؟!

- بیرم لەوەش کردۆتەوە، کاتێ کارگە کەوتەڕێ، من کاروبارەکانی دەسپێرمە جێگرەکانم و خۆم بۆ حەسانەوە ماوەیەك دێمە ئەورووپا.

- منیش هیوادارم وابێت... ئەم جلوبەرگەتان بۆ ئەو ڕۆژە تایبەتە دووریوە؟

- ناء زۆر پێشتر کڕیومە.

- زۆر جوانە... لەکوێ کڕیوتە؟

- لە لەندەنم کڕیوە... ئێوەش دەتانەوێ؟

- بۆ منالەکانم ئەویست.

- سبەینێ داوا دەکەم لە لەندەنەوە بۆتان بهێنن، تەنانەت ئەتوانم بیدەمە دوورینیش بۆ منالەکانتان.

- بژی... ئەگەر ئەم کاردم بۆ بکەن زۆر سوپاستان ئەکەم.

دەنگی وتاربێژ دووبارە بەرزبووەوە و قسەکەی بەوان بڕی، وتاربێژ، لەسەر گرینگیی ئەو کارگەیەی دروومان قسەی دەکرد کە خەریك بوو دەخرایە کار. کابرای تەڕپۆش درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی:

- ئەڵبەت پارەکەی گورج ئەدەمە خزمەتتان.

- شایانی نییە... ئەوە چ فەرمایشێکە.

- هەی برام، براییمان برایی گیرفانمان جیایی. لە بیرم چوو بیڵێم... ئەوەی ئەم کارگەیەتان لە حەفتەی پیشانگای دەستکردنە ناوخۆییەکاندا کردۆتەوە زۆر زۆر باشە چونکە لەم کاتانەدا هەستی نەتەوایەتی جەماوەر زۆرتر دەورووژێت.

- بەڵێ وایە و ئێمەش هەستی نەتەوایەتیی خەڵکمان لەکردنەوەی ئەم کارگەیەدا لەبەرچاو بووە.

دەستی بە گیرفانیدا کرد و بۆ شتێك گەڕا، بەڵام نەیدۆزییەوە. بۆیە بەکابرای گوت:

- ببوورن ئێوە جگەرەی (سالم)تان پێیە؟

- بەڵێ فەرموون.

- سوپاستان ئەکەم.

- لەبارەی وەستاکارەکانەوە قسەتان نەکرد... وەستای دروومان.

- لەوەشیان هەر دڵنیابن... وەستاکارمان لەوڵاتی هۆڵەندا هێناوە.

- کارێکی باشتان کردووە... ئەگەر وەستای وڵاتی خۆمان بن، ئیتر کارەکە باش دەرناچێت و لەئاکامدا دەسکردی نەتەوایەتیمان بەرەو لاوازی و لەناوچوون ئەڕوات.

- وایە... ئێوە راست ئەڵێن.

- ئەی ئەم رەنگانەی لەدیوارەکانتان داوە چین؟ هی ناوخۆن؟

- ناء برا... جاچۆن شتی وا ئەبێ؟ ئێمە پوڵ و پارەیەکی ئێجگار زۆرمان بۆ ئەم رەنگانە و وێنەکێشە بیانییەکان خەرج کردووە. تەنیا رەنگی دیوارەکانی دەرەوەی کارگە و تەنانەت بۆیاغچییەکانیشی هەرهی لای خۆمان بوون.

- زۆر باشە... هیوادارم رۆژێك بگات ئێوە لە رەنگ و بۆیاغچیی ناوخۆی وڵات بۆ رازاندنەوەی دیوی ناوەوەی کارگەکان کەڵك وەربگرن.

وتاربێژ لەپشتی بڵندگۆکەوە دەیگوت:

- "هیوادارم دانانی ئەم چەشنە کارگە گەورە نەتەوەییانە کە جێژنی کردنەوەی هاوکاتە لەگەڵ سازبوونی پیشانگای دەسکردە ناوخۆییەکان، کاریگەریی زۆرتر بکەنە سەر پیشەیی کردن و پێشکەوتنی پیشەسازیی وڵاتەکەمان.

کابرای کەڵەگەت کە لەراستیدا بەرێوەبەری کارگە بوو، بەبیستنی ئەو قسانە زۆرتر گەشایەوە. برادەرە تەرپۆشەکەی گلاسێکی بە خۆشیی ئەو خواردەوە و لێی پرسی:

- ببوورە بیرم نەبوو بپرسم ئەم کارگەیە چ جۆرە پارچەیەك بەرهەم دێنێ ؟

کاکی بەرێوەبەر لەحاڵێکدا داوای لە دیکەی میوانەکان دەکرد بخۆنەوە، لەولامدا گوتی:

- بەرهەمی ئەم کارگەیەمان پارچەیەکی تایبەتە بۆ مەتۆلکەی منداڵان کە پێی دەڵێن قوماشی ئەمریکی... ؟!

# نرخی کات

سەیرێکی لیستەی ئەم کەشتیانەم کرد ،کە خەڵکیان لە (**بەغاز**)دا ئەگەیاندە ئەستەمبۆڵ و زانیم ئەو کەشتییەی من پێی دەڕۆم، ٣٣ خولەك دواتر دەکەوێتە ڕێ. ئەگەر لەم ماوەیەدا تاکسیم گیر بهاتبا و خۆم بگەیاندبایە ((بەغاز)) ،ئەوا بەکارەکەم رادەگەیشتم، ئەگەرنا دەبوو ٤٥ خولەکی تر راوەستم تا کەشتییەکی دیکە ئەهات و ئەوکاتەش ئیتر هیچ سوودی نەبوو، چونکە ئیشوکارە زەروور و زۆر پێویستەکەم تێکدەچوو و بۆم نەدەکرا. تا ئێستا چەندین جار بەپەلە خۆم گەیاندبووە لێوار، کەچی دەرگاکانی داخرابوون و گوایە بێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت، قسەی زۆرم بە بەرێوەبەرانی لێوار گوتبوو! هەرچۆنێك بێت، تەنیا ٣٣ خولەکم مابوو، دەبوو بەپەلە بڕۆم و تاکسییەك بگرم تا بە ئیش و کارەکەم رابگەم. هەروا لەم خەیاڵانەدا بووم،کە دەنگێك ڕایچڵەکاندم:

- کاك عابدین خشتەکەتان تەواوکرد؟

بەتووڕەیی گوتم:

- کاکە پەلەی چیتە، خۆ حەوت مانگە لە دایك نەبوویت... ئێستە چ وەختی داواکردنی خشتەیە؟ نابینی هەموو فەرمانبەرەکان ڕۆیشتوون و دەوامیش تەواوبووە؟.

- هۆ عابدین خان...

لەدڵی خۆمدا گوتم:

- عابدین خان و دەردی گران ...

- هۆ عابدین خان

- چییه؟ چیت ئەوێ؟
- بەڕێوەبەر داوات دەکات؟

لەحاڵێکدا جنێوم بە بەختی خۆم دەدا، پلیکانەکانم سێ سێ و چوار چوار تێپەڕاندن و خۆم بەژووری بەڕێوەبەردا کرد و بەپەلە پرسیم:

- گەورەم فەرمایشێکتان هەبوو؟
- ئەوە چییە عابدین خان بۆ ڕەنگت پەڕیوە؟ نەخۆشی؟ بۆ کەوتوویتە هەناسەبڕکێ؟
- هیچ نییە گەورەم بۆ ئەوەی زووتر بگەمە خزمەتی بەڕێزتان لەپلیکانەکان زۆر بە پەلە هاتم.
- باشە .. دانیشە.
- نا ء گەورەم، گەر ئیزنم بدەن ئەڕۆم... بەڕێزتان فەرمایشێکتان هەبوو؟.
- من؟ نا ء هیچ کارێکم پێتان نییە.
- گەورەم دەرکەوان پێی گوتم.

بەڕێوەبەر دەرکەوانی بانگ کرد:

- من کەی گوتم کارم بەعابدین ئاغە هەیە؟
- با خۆتان فەرمووتان گەورەم.
- ئاخر کەی؟
- هەرئەم چەند ساتەی پێشتر.
- ئاها... ها... زانیم... بۆ ئیشێك بانگم کردبووی ،کەچی نازانم کارەکەم چی بوو... ڕاستە گوتوویانە پیری و هەزار دەردی بێ دەرمان.

سەیرێکی تری کاتژمێرەکەم کرد، ۳۰ خولەك مابوو، ئەگەر هەموو ڕێگاکەم بە ڕاکردن ئەبڕی و تەکسیشم دەست دەکەوت، ڕەنگبوو بمتوانیبا پێ ڕابگەم. کاکی بەڕێوەبەر درێژەی بەقسەکانی دا:

- کورە خۆ پۆلایش بوایە لەم ۲۵ ساڵەدا ژەنگی دەهێنا چ بگا بەمنی گۆشت و ئێسقان. وابزانم ئیشێکی گرینگم پێت هەبوو ،کەچی ئێستا لەبیرم چووەتەوە. قەیدی نییە تۆ بڕۆ... ئەگەر بیرم کەوتەوە بانگت دەکەم.

بەخۆشحاڵییەوە پرسیم:

- گەوەرم ئیزن ئەفەرموون بڕۆم؟
- زۆر بە پەلەیت؟
- دەبێ بە کەشتی رابگەم.
- کەوابوو هیچ کارێکم پێت نییە... بڕۆ خوات لەگەڵ
- دەی جارێ لەسەر ئیزنتان.

هێشتا چەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبوومەوە، کە دەنگی (نەکەرە)ی دەرکەوان لەجێی خۆم وەستاندمی و بەناچار گەڕامەوە ژووری بەڕێوەبەر. ئەویش کاتێ منی لەبەرانبەر خۆیدا بینی گوتی:

- بیرم هاتەوە... لەبیرتە گوتت هێلکەی ئەمریکیت خستۆتە ژێر مریشکەکانتان؟... پێم بڵێ ئەو هێلکە ئەمرکیانەت لەکوێ دەست کەوتن.

- لەبەشی راوێژکاریی کشتوکاڵم کڕین.
- باشە ئەو بەشە لەکوێیە؟
- لەمەیدانی ((بیازیە))دایە.
- زۆر باشە، سوپاس ئیتر بڕۆ با زووتر بگەی بە کارەکەتدا.

سەیرێکی کاتژمێرەکەم کرد دیتم تەنیا ٢٧ خولەك ماوە کەشتی بکەوێتەڕێ ئەگەر بتوانم گورج خۆم بگەیەنمە سەرشەقامەکە...

- هۆ عابدین ئاغە...

لام کردەوە... خودی بەڕێوەبەر بوو لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە بانگی دەکردم.

- بەڵێ گەورەم.
- ئەرێ هێلکەکانت یەکی بەچەند کڕین؟
- یەکی بە ٥ قرۆش گەورەم.
- باشە، زۆریش گران نییە... دەی تۆ بڕۆ.

بە راکردن شەقامەکەم ئەبڕی، کە دەنگێك لەجێی خۆم وشکی کردم...

- کابرای کەر، چاوت لەبەر پێی خۆت بێ، بۆچی چوارناڵ غار دەدەی؟

کاتێ لام کردەوە، دیتم پیاوێك لەولامەوە کەوتۆتە سەرزەوی، بەڵام بۆئەوەی بگەمە کەشتییەکە، هیچم نەوت و ڕۆیشتم و هەروا بەجێم هێشت. دیسانەوە پیاوێکی تر گوڕاندی:

- هۆی کەرە، وریا بە، ئەمە چ ڕۆیشتنێکە؟

کابرا ناهەقی نەبوو، چونکە من بەتوندی پێمدا دابوو و خستبووم. دیسانەوە یەکێکی تر چەند جنێوی تاڵی دامێ ،بەڵام من بێ ئەوەی وڵامی کەس بدەمەوە هەر ڕام ئەکرد، کە کتوپڕ لە کابرایەکی زەبەلاحم دا و خۆم نەخشی زەوی بووم ،کەچی بێ ئەوەی بزانم من بووم یان نا هەستام و دەستم کردەوە، بە ڕاکردن چونکە ٢٢ خولەکی تر کەشتییەکە دەکەوتەرێ و من بەجێدەمام. کە گەیشتمە سەرشەقام وەستام بۆ تەکسی، کەچی تەکسی هەر نەهات و بەناچار ڕووم کردە تەکسییەکانی (فال کروش) و لەشۆفێرەکەم پرسی:

- کاکە تاکوێ ئەڕۆی؟
- تۆ بۆ کوێ ئەڕۆی؟
- ئەمەوێ برۆمە لەنگەرەکە.
- برۆ مامە گیان... ئێمە ڕێگەمان ناکەوێتە ئەوێ... بەڵام ئەگەر سەرلەبەیانی زوو بێیت ڕەنگە بتوانم بتگەیەنم.

ئەوەندە تووڕە و قەڵس بووم لەبەر خۆمەوە هەر جنێوم ئەدا. کەوتمە ڕاکردن، چەند هەنگاوێك ڕۆیشتبووم کە دەنگێکم بیست، وەستام و سەیرێکم کرد کابرایەك ڕاوەستابوو:

- سلاو عابدین خان.

بێ ئەوەی بیناسمەوە چاك و چلۆنیم لەگەڵ کرد. لێی پرسیم:

- بەم پەلەپەلە بۆ کوێ ئەچی؟
- ئەمەوێ بگەمە کەشتی.
- باشە بۆ کوێ؟
- بۆئەستەمبۆڵ.

- مردووت مرێ وامزانی بۆ سەفەری هەندەران ئەڕۆی... دەی حاڵ و باڵت چۆنە؟
- زۆر سوپاس شوکر باشم.
- لەبیرت دێ کەی یەکترمان دیوە؟
- وابزانم زۆر لەمێژە
- دوایین جار کە یەکترمان بینی کەی بوو؟
- وەڵڵا... لەبیرم نییە... وابزانم...

من ١٨ خولەك کاتم مابوو ئەویش هەر بەرۆکی بەرنەئەدام.

- بەراستی بیرەوەرییەکانی سەردەمی سەربازی شیرینن.

هەرکە باسی سەربازیی کرد ناسیمەوە... ئەو (ملازم)ە بوو، کە خۆی بەژەنەڕاڵ ئەزانی.

- دەی لەسەر ئیزنتان با من بڕۆم ئەبێ بگەمە کەشتییەکە
- عابدین گیان با دواتریش یەکتر ببینینەوە.
- باشە هیوادارم.

لەم کاتەدا تەکسییەکی شەق و شڕ دەرکەوت و منیش بەسەر و دەست ئاماژەم بۆ ئەکرد کە رایگرێ، کەچی شۆفێرەکە بێ ئەوەی رایگرێ قیڕاندی:

- کابرای وڵاخ دەوروبەری خۆت ببینە... بۆ هاتوویتە ناوەڕاستی شەقامەکە؟

بێ ئەوەی وڵامی بدەمەوە ڕام کرد بۆ لای تەکسییەکی ٥ قڕوشی کە لەولاوە دەهات. تەکسی رایگرت کەچی تا ویستم سواربم کەوتەڕێ و ٧ هەنگاوێك لەولاترەوە وەستا، منیش بەراکردن خۆم پێی گەیاند ،بەڵام تادەستم برد بۆ دەسگیرەکەی کەوتەڕێ و بۆی دەرچوو. لەوە ئەچوو کابرای شۆفێر گاڵتەم پێبکات. چونکە تا من ئەوەستام ئەویش رای ئەگرت ، کە من ئەمویست سواربېم لێی ئەدا ئەڕۆیشت. سەرتان نەیەشێنم دوای ١٥ ـــ ١٦ جار راکردن و وەستان و بەجێمان، خۆم گەیاندێ و سواربووم. پاش ئەوەی کەمێك ڕێگەمان بڕی پرسیم:

- ئەرێ کاکی شۆفێر ئەکرێ بڵێی بۆ ئاوا گاڵتەت ئەکرد و منیشت ئەوەندە هیلاك کرد؟

- کوره مەلێ گەورەم... ئەم فەرمایشتە چییە ئەیفەرمووی؟

- ئەی بۆچی چەندین جار هەر ڕات ئەگرت و ئەڕۆیشتی؟

کاکی شۆفێر تووڕە بوو و بەقەڵسییەوە گوتی:

- ئەرێ کابرا بە تۆچی من ئەوەستم یا ئەڕۆم... ئەگەر پێت ناخۆشە بڕۆ دابەزە.

- ئێستە باشە بۆ کوێ ئەچی؟

- ئەڕۆمەوە بۆماڵ.

- من ژمارەکەت دەنووسم و دەیدەمە پۆلیس تاجارێکی تر ئەم کارانە نەکەی... بڵێ بزانم ژمارەکەت چەندە؟

- ژمارەی پێڵاوەکانم بدەم یاهی کراسەکەم.

بەتووڕەیی قیڕاندم:

- ئەگەر ژمارەی کانتێری کارەبایەکەتان بدەی پێموایە باشترە.

- ئینشەڵڵا جاری دواتر کە هاتییەوە پێت ئەدەم.

دیتم قسەکردن بێ سوودە ،بۆیە لێی دابەزیم و رام کرد بەرەو لای تەکسییەك ،کە چەند هەنگاو لەولاترەوە ڕای گرتبوو ،کەچی تا ویستم سوارببم ئەویش لەجێی خۆی دەرپەڕی و ٢ هەنگاو دوورتر ڕای گرتەوە. خۆمم گەیاندێ و ویستم سواربم دیتم پڕە. بەتووڕەیی گوتم:

- تۆ کە ئەزانی ئوتۆمبێلەکەت پڕە بۆچی هەرلە خۆڕا رایدەگری بۆ کەسانی تر؟

- ئێ کاکە کێ داوەتنامەی بۆ ناردووی بێیت؟

- تۆ چەندجار وەستایت و منیش وامزانی خاڵییە.

- ڕاگرتنیش لەملاولەولا قەدەغەیە؟ وەستام کە وەستام... ڕەنگە تۆ من بەتەکسیی ٥ قڕوشی تێگەیشتبی؟

کاتێ جوان سەیرم کرد دیتم ژمارەی تایبەتە... بۆیە داوای لێبوردنم لێ کرد:

- ببوورە ژمارەکەم نەبینی... ئاخر زۆر پەلەمە و ئەبێ بگەمە لەنگەرەکە و تەنیا ١٣ خولەکیشم ماوە.

شۆفێرەکە کە پیاوێکی قەڵەو بوو بەزەیی پێمدا هاتەوە و گوتی:
- ئێستا کەوای لێهات سەرکەوە ئێمەش بۆ ئەوێ ئەڕۆین.
- زەحمەتتان نادەم؟
- نا کاکە زەحمەتی چی؟ فەرموو سەرکەوە.

خوا خەیری بنووسێ سواری کردم و کەوتینەڕێ. دوایی تێگەیشتم کە ئۆتۆمبێلەکەیان عەیبی هەبووە، بۆیە هەر ئەوەستا و ئەڕۆیشت و ئەوەستایەوە. شۆفێرەکە لەڕێدا چەندجار دابەزی و دەسکاری ئۆتۆمبێلەکەی کرد،بەڵام عەیبەکە هەرمایەوە. ویستم دابەزم و بەجێیان بهێڵم ،بەڵام لەڕووم نەهات و دانیشتم. کاکی شۆفێر بانگی کردین و گوتی:
- بێ زەحمەت تۆزێ پاڵی پێوەنێن بەڵکوو بکەوێتە کار.

لەحاڵێکدا جنێوم بە شانسی خۆم دەدا، لەگەڵ ئەوانی تر کە تینە پاڵ پێوەنان تا هەموو گیانمان شەلاڵی ئارەقە بوو، کەچی ئوتۆمبێل هەر نەکەوتە کار. نازانم ٣ یان ٤ مەتر پاڵمان پێوەنا، بەلام بەلای منەوە چەندین کیلۆمەتر بوو. دەستم هەڵگرت و گوتم:
- براینە داوای لێبوردن دەکەم... من پەلەمە و ئەبێ بگەمە کەشتییەکە بۆیە ،ناچارم بەجێتان بهێڵم.

گورج کەوتمە ڕێ و ڕام کرد. لەڕێدا لەسەریەك ئەم قسانەم دەبیست:
- کابرای کەر بەرچاوت ببینە — هۆی... ئێرە مەیدانی فتبۆڵ نییە — ئەی قوربانی خوابم بۆ بەندەکانی و...

زۆرکەسیش جنێوی خراپیان پێدەدام و من بێ ئەوەی وڵامیان بدەمەوە هەر ڕام دەکرد:
- ئەهای عابدین خان راوەستە ئیشم پێتە.

نەمزانی کێ بوو. لاشم لێ نەکردەوە. من رام ئەکرد و ئەویش بەشوێنمدا، تا لەسەر پردێکدا پێم گەیشت و وتی:
- کاکە بۆ وا لێمان ڕائەکەی خۆ داوای پوڵ و پارەمان لێ نەکردووی؟

بەسەرسووڕمانەوە لام کردەوە و پرسیم:

- فەرمووت پوڵ؟ پوڵی چی؟

کابرا چاوی لێ بریم و بەواق سەرسامییەوە گوتی:

- زۆر زۆر داوای لێبوردن دەکەم. ئێوەم بەعابدین ئاغەی برادەری خۆم زانیبوو. کاکە نازانی ئەو کابرایە چەندە نامەردە و چۆن هەرچیم هەیە خواردوویەتی و تەنانەت...

- کاکە ببوورن من زۆر بە پەلەم.

- بەڵێ... عابدین ئاغە بڕیاری دابوو رۆژی هەینی رابردوو بێتە ماڵی ئێمە.

کابرا توند دەستی گرتبووم و من نەمئەتوانی خۆمی لێ ڕزگار بکەم ،بۆیە گوتم:

- کاکە دەستم بەر بدە. من ئەبێ بڕۆم:

- ئەی چی برا... ئەو بێ شەرەفە هەررۆژە یەکێك لە کەوچکە چایەکانی منی دزی ،کە هی سەردەمی یوسف پاشا بوو...

کاتژمێرەکەم وای پیشاندەدا کە کەشتییەکە کەوتۆتەڕێ بەڵام لەدڵی خۆمدا دەمگوت بەشکوو چەند خولەکێك هەروەکو جاران دواکەوتبێ. رووم لەکابرا کرد و گوتم:

- ئەرێ برا ئیزنم ئەدەی بڕۆم؟

- بەڵێ، لەمە زیاتر زەحمەتت نادەم. بڕوا بکە لەم دونیایەدا کەمتر کەسێك هەیە وەك تۆ لەو عابدین خانە بێ شەرەفە بچێت. من لە فلانە فەرمانگەم و ناوم ((مەفتوون))ە. لە هەرکەس بپرسن مەفتوون کێیە پێتاندەڵێت. هیوادارم رۆژێك گەورەمان بکەیت و سەرێکمان لێبدەیت. ئەرێ نەتفەرموو ناوت چییە؟

- عابدین!...

- ئێ... زۆر سەیرە، هەروا کە خۆت لەو ئەچی ناویشت هەر لە ناوی ئەوە!

کابرا تۆزێ دەستی شل کردبوو. بۆیە گورج و گۆڵ خۆم لێێ ڕزگارکرد و کەوتمە راکردن تاخۆم گەیاندە لەنگەرەکە. شوکر کەشتییەکە نەڕۆیشتبوو. منیش سەرکەوتم و خۆم وەکوو پارچە گۆشتێك فڕێدایە ناویەوە و هەرچەند هەزار جۆرە قسەی تاڵ و جنێوم پێ درابوون، هێشتا ڕازی بووم ،چونکە هەرچۆنێك بوو خۆم گەیاندبووە کەشتی. ماوەیەك لەناو کەشتیەکەدا بەسەر کورسییەکەوە دانیشتم و حەسامەوە،

کەچی کەشتییەکە هەرنەکەوتەڕێ. لەوەش خراپتر خەڵکەکە بوو، کە هیچ پەلەیەکیان نەبوو و زۆر لەسەرخۆ سەر دەکەوتن. پێنج خولەکی پێچوو، کەشتی جووڵەی نەکرد، دە خولەکی پێچوو هەر نەجووڵا، کە بووە چارەگێك و هەر نەکەوتەڕێ لەکەشتیوانەکەم پرسی:

- ئەرێ بڵێ بزانم... بەرنامەی ڕۆیشتنی کەشتییەکان گۆڕاوە؟

- نەخێر کاکە بەرنامە ١٥ ڕۆژی دیکە دەگۆڕێت واتە بەرنامەی هاوینە ١٥ ڕۆژی تر دەست پێدەکات.

بەتووڕەییەوە قیڕاندم:

- هەر ئەوەیە کە ئێمە نابینە هیچ. خەڵکی وڵاتانی تر حسێبی یەك چرکەش ئەکەن، کەچی لای ئێمە ٥ کاتژمێر و ٥ ڕۆژیش ناخوێنرێتەوە، ئەی ئەم میللەتە کەی لەنرخی کات تێ ئەگات؟

کەشتیوان ئەیویست قسە بکات ،بەڵام من ماوەم نەئەدا و هەر قسەم ئەکرد:

- لەحاڵێکدا خەڵکی دیکە دەیەوێ بگاتە گۆی مانگ، ئێمە تەنانەت بچووکترین کاریش ناتوانین بەرێك و پێکی ئەنجام بدەین... دیارە هەر ئەوان دەبێ پێشبکەون... هەموو کارێك لەکاتی خۆیدا ئەبێ بکرێت...

چەند کەسیش لەناو کەشتییەکەدا پشتیوانیان لەقسەکەی من ئەکرد و دەیانگوت:

- لەکامە وڵاتدا بیستوومانە کەشتیەك یا ئۆتۆمبێلێك ٢ خولەك لە کاتی دیاریکراوی خۆی درەنگتر بکەوێتە ڕێ؟

لەناو ئەو جەماوەرەی لەدەورم کۆببوونەوە دەنگ و هەرا بەرزبووەوە:

- بەراستی جێێ شەرمەزارییە.

- ئاوا نابێ چارەیەك پێویستە.

فەرمانبەرێکی ناو کەشتییەکە هاتە پێش و گوتی:

- گەورەم لاموایە کاتژمێرەکەی ئێوە خەوتبێت، چونکە ئێستا کاتژمێر شەش و سی و حەوت خولەکی تەواو پیشان ئەدا.

بەسەرسووڕمانەوە پرسیم:

- فەرمووت شەش و سی و حەوت خولەك؟

یەکێك دەنگی بەرزکردەوە:

- کاتژمێرەکەی ئێوە درۆ دەکات، هی من شەش و سی و پێنجە.

یەکێکی تر هەڵیدایە:

- هی هەردووکتان درۆ ئەکەن من لەگەڵ رادیۆدا کۆکم کردووە و ئێستاش شەش و سی و چوار خولەکە.

- نەخێر کاتژمێر شەش و سی و حەوتە ئەوەی ئێوە لەدوایە.

من کە دیتم بووەتە شەڕی کاتژمێر، لە کابرام پرسی:

- باشە بابڵێین ئەوەی ئێوە راستە، ئەی بفەرموون بۆچی ناکەونە رێ؟

- جا بۆچی بکەوینە رێ؟ خۆ هێشتا ١ خولەکمان ماوە بۆ رۆیشتن.

- چۆن؟... من هەموو دوا نیوەرۆیەك هەر بەم کەشتییە....

- کاکە ئێوە بۆکوێ تەشریف ئەبەن؟

- بۆ ئەستەمبۆڵ.

هەموو ئەوانەی کە تاچەند چرکە پێشتر پشتگرییان لە قسەکانی من دەکرد دایانە قاقای پێکەنین. فەرمانبەری کەشتییەکەش بەبزەیەکەوە گوتی:

- بەڕێزم، ئێوە بەهەڵە هاتوونەتە ناو ئەم کەشتییە، کەشتیی ئەستەمبۆڵ نیوسەعات لەمەوپێش کەوتەرێ...!

# مەرگی مووچەخۆرێك

کاك محەمەد، فەرمانبەری چەندین ساڵە و بەتەمەن، وەك هەمیشە ٤٥ خولەك پێش کاتی خۆی گەیشتە فەرمانگە. وەك هەمیشە پاڵتۆ پینەکراوەکەی هەڵواسی، وەك هەمیشە جانتا کۆن و رەنگ پێوە نەماوەکەی خستە سەرمێزەکەی و وەك هەمیشە خۆی خستە سەر کورسییە شکاوەکەی، کە وەکوو هەمیشە ئەلەقی و جیڕەی دەهات.

پاش ئەوەی دانیشت، دەستی کردە کۆکین و تا توانیی بەدەنگی بەرز کۆکی، بەڵام لەناکاو کۆکەی بڕی و چاوی بڕییە رۆژنامەی سەر مێزەکەی و چەند دێڕێکی لێ خوێندەوە، تێگەیشت رۆژنامەی دژی رژێمە و باس و بابەتی دژ بە هەڵسوکەوتی رژێم بلاّودەکاتەوە. بۆیە هەموو گیانی لەرزی، ئەگەر بومبایەکی بەسەر مێزەکەیەوە بدیبایە، ئەوەندەی دیتنی ئەو رۆژنامەیە نەدەترسا. بۆئەوەی دڵنیا بێت بەهەڵەدا نەچووە، لەمێزەکەی دوورکەوتەوە و بەوردی سەرنجی رۆژنامەکەی دا و بۆی دەرکەوت هەڵەی نەکردووە و ئەوەش هەمان رۆژنامەی بەناوبانگی دژی دەسەلاّتە. بەخۆی گوت:

- دڵنیام ئەمە کردەوەی دوژمنەکانی منە بۆ تاوانبار کردنم. باش بوو زوو گەیشتم... ئەگەر درەنگ بهاتبام ئەوان هاوکارەکانمیان ئەهێنایە سەری و دەیانگوت: ئێمە وامانزانی کاك محەمەد پیاوێکی ولاّتپارێز و پاك و خاوێن و دڵسۆزە، کەچی ئێستا ئەبینین دژی حکوومەتە! بەداخەوە، تائێستا متمانەشمان پێی هەبوو.

کاك محەمەد لەحاڵێکدا هەوڵی ئەدا چاوی بەنووسراوەکان نەکەوێت و نەیانخوێنێتەوە، بڕیاریدا هەرجۆرێك بووە لەناوی بەرێت ،نەوەك هاوکارەکانی بەدەستییەوە بیبینن و بەتاوانی خوێندنەوەی باس و بابەتی دژی حکوومەت و هاوبیری لەگەڵ دوژمن بیخەنە بەندیخانەوە.

ویستی بیخاتە سەر مێزی یەك لەهاوكارەكانی ،بەڵام بیری لەوە كردەوە كە جێ پەنجەی بەرۆژنامەكەوە دیار ئەبێت و بێجگە لەوەش هەر دەرئەكەوێ كاری خۆی بووە، چونكە هەمیشە پێش لەوانی تر دەگەیشتە فەرمانگە. پاشان ویستی بیدڕێت و بیخاتە ناو زبڵدانەكەوە، بەڵام ئەم كارەش هەر سوودی نەبوو، چونكە ئەیانزانی یەكەم كەس هەر ئەو بووە ئەم كارەی كردووە. نەیشیدەتوانی بیخاتە ناو جانتاكەیەوە، لەبەر ئەوە ئەگەر پێیان بزانیبایە، بەبەڵگەی زیندوو و ئاشكراوە دەیانگرت. كە وابوو ئەبێ رۆژنامەكە بخاتە سووچێكی مێزەكەی. بۆیە گورج سەیرێكی ئەم لاو لای كرد و كاتێ كەسی نەدیت، دەركی مێزەكەی كردەوە و رۆژنامەكەی خستە گۆشەیەكییەوە... بەجۆرێك گرتبووی كە دەستی بەو نووسراوە دژە حكوومیانە نەكەوێت. هێشتا دەركی مێزەكەی پێوە نەدابوو هەستی كرد یەكێك بەپشت سەرییەوە راوەستاوە:

- رۆژباش كاك محەمەد... ئەحواڵت چۆنە؟

لەحاڵێكدا ئەوەندەی نەمابوو گیانی بەكوونە لووتیدا دەربچێت، لای كردەوە دیتی بەڕێوەبەری فەرمانگەیە لەپشتە سەرییەوە!... چۆن شتی وا ئەبێ كە بە هاتنی بەڕێوەبەری نەزانیبێ؟

بە پەشۆكاوی سڵاوی لێ كرد و پاشان گورج دەركی مێزەكەی داخست. بەڕێوەبەر تۆزێك لەلای وەستا و ئینجا بەجێی هێشت و چووەدەرەوە. بەڵام ئەو لەم هاتن و چوونەی بەڕێوەبەر دوودڵ بوو، لەدڵی خۆیدا گوتی:

- دڵنیام دوژمنەكانم چوونەتە لای و پێیان گوتووە: ((گەورەم دەزانن بۆچی كاك محەمەد بەیانیان بەر لە هەمووومان دێت؟ لەبەر ئەوەی لەماڵەوە ناتوانێ باس و بابەتی رۆژنامەكانی دژی حكوومەت بخوێنێتەوە و زووتر دێتە ئێرە تا بەدڵی خۆی بیانخوێنێتەوە. ئەگەر بروا ناكەن بەیانییەك زوو برۆنە لای و سەری لێبدەن تا بەچاوی خۆتان ببینن.)) جەنابی بەڕێوەبەریش بروای كردووە، هەر ئەوەتە ئەمرۆ لەكاتی شاردنەوەی رۆژنامەكەدا چاوی لێبڕیبوو!

كاك محەمەد ئەوەندە نوقمی بیرو خەیاڵ ببوو، وا خۆی بە سەر مێزەكەیدا دابوو ،كە هیچ كام لەهاوكارەكانی نەدیبوو. سڵاوی دۆستانە و رۆژباشی برایانەی هیچ كامیانی نەبیستبوو. هەروا نوقمی بیر و خەیاڵی تاڵ و ئاڵۆزی خۆی بوو و لەدڵی خۆیدا هەر دەیگوت:

- بۆچی ئەبێ ئاوا کارێکی خراپم لەگەڵ بکەن؟ خۆ من تائێستا تەنانەت بەکەسیانم نەگوتووە پشتی چاوت برۆیە!

ڕاست بوو، کاك محەمەد لەماوەی ٣٠ ساڵ خزمەتیدا هەمیشە ئامۆژگارییەکانی باوکی لەمێشکی ئەزرینگایەوە، کە پێی گوتبوو: (( نابێ لەگەڵ هیچ کەسێك و هیچ شتێکدا پەیوەندی و تێکەڵاوی و هاتوچۆت هەبێت)) و ئیتر بێجگە لەخزمەتی دڵسۆزانە هیچی تری لەخۆیدا شك نەدەبرد. نە ئەیویست ڕژێم بگۆڕێت و نەحەزیشی بە دەستاودەست دەکرد لەحیزبێکەوە بۆحیزبێکی تر. واتێگەیشتبوو کە ئەو یا هەرکەسێکی تری وەك ئەو هەرگیز لەکاروباری خوا و حکوومەت سەردەر ناکەن! لەگەڵ ئەوەشدا زۆر حەزی ئەکرد بەرلەوەی خانەنشین بکرێت، بەچاوی خۆی بەڕێوەبردنی یاسایی و سەقامگیری و دامەزراندنی تەواوی وڵات ببینێت.

بەپێویستی دەزانی پێش ئەوەی هەموو شتێك تێك بچێت و بارودۆخی خراپتر ببێت، خۆی دەست بەکاربێت و شتێك، بکات ،چونکە دوور نەبوو چەند خولەك دواتر کاکی بەڕێوەبەر داوای بکات و بێ ئەوەی گوێ بداتە قسەکانی، بە تووڕەیی پێی بڵێت:

- زۆر شەرمەزارییە بۆ تۆ... ئەزانی چەندە جێی ڕێز و متمانەی ئێمە بووی؟ تۆ لەملاوە مووچەخۆری ئەم حکوومەتەیت و لەولاوە ئەبیتە هاوبیری دوژمنەکانی، کە دەیانەوێ وڵات بشێوێنن و عەیبەکانی خۆیان داپۆشن؟ من ناچارم ڕاپۆرتی ئەم خیانەتەی تۆ بدەمە بەڕێوەبەران و داواش بکەم زووتر ئەم دۆخە نالەبارە بگۆڕن.

پێویست بوو گورج و گۆڵ بگاتە خزمەتی بەڕێوەبەر و تەنانەت قاچیشی ماچ بکات و پێی بڵێت:

- گەورەم... بڕوا بفەرموون من هیچ نیەتێکی خراپم نەبووە. پەنجا و حەوت ساڵ لەتەمەنم تێ ئەپەڕێت و سی ساڵ و شتێکە لەم فەرمانگەیەدا دامەزراوم و لەم ماوەیەدا هەمیشە دڵسۆز و گوێڕایەڵی یاسا و حکوومەت بوومە. چ مافیان پێشێل کردبێتم و چ پلە و پایەیان هێنابێتمە خوارەوە، هەر ڕازی بووم و فزەم نەکردووە. ساڵەهایە هەر هۆتافی بژی و بمێنێ بۆ حکوومەت دەدەم و هەمیشەش کاتی دەنگدان، لەجێی یەك دەنگ، دە دەنگ و بیست دەنگم بەجارێك بۆ حکوومەت داوە و تەنانەت لەساڵێکدا ١٥ ــ ١٦ تەلگرافی پیرۆزباییم بەبۆنەی دیموکراتیەتی بێ وێنەی حکوومەتەکەمانەوە بەملاولادا ناردوون. سەبارەت بەو ڕۆژنامەیەش، سوێند ئەخۆم تاقە ڕستەیەکیشم لێ نەخوێندۆتەوە...

لەم کەین و بەینەدا خزمەتکار هات و پێی ڕاگەیاند کە جەنابی بەڕێوەبەر داوای کردووە. سەری لێشێوا و هەموو لەشی کەوتە لەرزین. لەجێی خۆی هەستا و بەرەو ژووری بەڕێوەبەر کەوتەڕێ، کەچی هەموو قسەکانی پێشووی لەبیرچوونەوە و لەپشت دەرگاکەدا بەهەزارحاڵ چەند وشەیەکی وەبیر هێنانەوە. کاتێ ڕۆیشتە ژوورەوە، بەڕێوەبەر هەڵسوکەوتێکی زۆر ساردی لەگەڵ کرد و پێیگوت:

- ئەرێ محەمەد ئاغە... بیستوومە ماوەیەکە ئەرکەکانت بەجوانی بەجێ ناهێنیت و وڵامی خەڵك بە جوانی نادەیتەوە.

کاك محەمەد لەدڵی خۆیدا گوتی:

- ئەوانەی ئەو دۆخەیان بۆ دروست کردووم، دەتوانن درۆی ئاواشم بۆ هەڵبەستن.

پاشان هەموو هێزی خۆی هێنایە سەرزمانی و لەوڵامی بەڕێوەبەردا گوتی:

- گەورەم درۆیان عەرزکردووی... ئەوانە بۆ لەناوبردنی من ئەو پیلانەیان داڕشتووە.

- حەز ناکەم تاوانەکانی خۆت بخەیتە ملی ئەوانی تر ... من خۆم کەم و زۆر ئاگاداری کردەوە چەوتەکانی تۆم.

کاك محەمەد وڕ و گێژ بوو:

- ئا... و...وا... کەواتە کاکی بەڕێوەبەر ڕۆژنامەکەی بەدەستمەوە بینیوە.

نەیتوانی هیچ بڵێت، هەر بۆیە بەترس و لەرز و گۆلەگۆل ژووری بەڕێوەبەری جێ هێشت و خۆی تەپاندە سەر کورسییەکەی و لەحاڵێکدا قسەکانی بەڕێوەبەر لەمێشکیدا دەزرینگانەوە، نوقمی بیرکردنەوە بوو:

- جەنابی بەڕێوەبەر ئەم بابەتە گرینگ و هەستیارە پشتگوێ ناخات... هەر ئەوەندەیە ئاماژەیەك بکات و ئیدی پۆلیس بێت و دەسگیرم بکات. ئەوکاتە هەموو هاوکارەکانم بەمەسەلەکە ئەزانن و...، کە واتە، وا باشترە هەر خۆم بڕۆمە لای و ڕاستییەکەی پێ بڵێم.

نامەیەکی گرتە دەستییەوە و بەبیانووی ئیمزاکردنی، بە کتوپڕی خۆی بە ژووری بەڕێوەبەردا کرد. بەڕێوەبەر هێشتا تووڕەبوو و نیازی نەبوو هیچ ڕوویەکی خۆش پیشانی کاك محەمەد بدات. ئەویش نامەکەی بەئەسپایی دایە دەستی و بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی:

- گەورەم... ئەزانم بۆچی هێندە لێم تووڕەن، بەڵام بڕوا بفەرموون هیچ ئاگایەکم لەو ڕۆژنامە نەبووە و نییە.

- ئەگەر بێ ئاگا بووبی لێی بۆچی لەناو مێزەکەتدا پەنهانت کرد... هێشتا هەر لەوێیە؟

- بەڵێ گەورەم هێشتا لەوێیە... بەڵام دڵنیاتان دەکەمەوە هێشتاش تاقە دێڕێکم لێ نەخوێندۆتەوە. من سی و دوو ساڵە مووچەخۆری ئەم فەرمانگەیەم. لەم ماوەیەشدا چ خەڵات کرابێتم و چ سزایان دابم، هەر لەحکوومەت رازی بووم. ساڵەهایە پشتیوانیم لێ کردووە و لەکاتی هەڵبژاردنەکانیشدا بەجێی یەك دەنگ، ١٠ ــ ١٥ دەنگم بەجارێك بۆ داوە... سوێند ئەخۆم هیچکات حەزم لەگۆڕینی حکوومەت نەکردووە و هیچ کاتیش لەبیری ئاوا شتێکدا نەبووم.

بەڕێوەبەر بەقەڵسییەکەوە گوتی:

- باشە... برۆ ئەو رۆژنامەیە و جانتاکەشتی لەگەڵ بهێنە.

- بەسەرچاو گەورەم هەر ئێستا ئەیهێنم... خۆزگە بمردمایە و پاش ٣٠ ساڵ خزمەتی دڵسۆزانەم، ئاوا رۆژێکم بۆ پێش نەهاتبا.

کاتێ کاك محەمەد گەیشتەوە ژووری بەڕێوەبەر، ئەو لەگەڵ جێگرەکەیدا قسەی دەکرد. بەڕێوەبەر رۆژنامەکەی لەدەست کاك محەمەد وەرگرت، سەیرێکی کرد و بە جێگرەکەی گوت:

- بڕوانە بۆ ئەم بەشەی سکاڵای جەماوەر... شکایەتیان لە ئێمە کردووە، گورج روونکردنەوەیەك بنووسن و ئەم شتانە بەدرۆ بخەنەوە و بۆیانیان بنێرن.

پاشان ڕووی کردە کاك محەمەد و گوتی:

- تۆش فەرموو برۆرە ماڵ و چەند رۆژێك بحەسێوە، لەوانەیە لەم رۆژانەدا بەشی دووهەمی یاسای دامەزراندنی وڵات بەڕێوە بچێت. منیش گاڵتەم لە گەڵ کردی و وابزانم ماندووم کردبی.

لەچاوتروکانێکدا ئەو هەموو خەم و پەژارە و ترس و لەرزە گۆڕا و بوو بە بەختەوەری. کاك محەمەد ویستی سوپاسی بەڕێوەبەر بکات، نەیتوانی. ویستی داوای لێبوردن بکات، زمانی نەگەڕا. تەنیا ئەوە نەبێ چەند وشەی بێ سەر و بن لەزاری هاتنەدەر و بەهەزار زەحمەت خۆی بە کێش کرد و لەژووری بەڕێوەبەر هاتەدەرێ. شەکەت و ماندوو لە پشت مێزەکەی دانیشتەوە. پاشان بێ ئەوەی قسەیەك بکات، تێرتێر پێکەنی.

ئەم پێکەنینە بە واتای رزگاربوونی لەو گیروگرفتەی ئەمرۆ بوو. ناهەقیشی نەبوو، چونکە پاش ٣٠ ساڵ خزمەت و ماندووبوون، ئێستا بەئاواتی خۆی گەیشتبوو و خانەنشین کرابوو.

کەچی چەند چرکە دواتر هیچ دەنگێکی لێوەنەهات و ژوورەکەش مات بوو. کاتێ هاوکارەکانی هەستان و هاتنەلای، واقیان وڕما و لەجێی خۆیان وشك بوون... چونکە بینییان کاك محەمەدی ماندووی زەحمەتکێش لە گەرمەی قاقای پێکەنیندا، دڵی لەخۆشیی ئاوا مزگێنییەکدا وەستاوە و ڕۆحی دەرچووە!...

***

***سەرچاوە: بەشی یەکەمی دوای پێشەکی: (عەزیز نەسین لە زمانی خۆیەوە)، سایتی کتابناك/ ژالە سەمەدی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی.../ بەشی دووەم، (بەرهەمەکان)، لە ویکیپیدیا و چیرۆکەکانیش لە وەرگێڕانەکانی (ڕەزا هەمرا) وەرگیراون ، کە بەش بەحاڵی خۆی زۆربەی کورتە چیرۆکەکانی عەزیز نەسینی وەرگێڕاونەتە سەر زمانی فارسی***